هەرێمی کوردستانی عیراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# زمانو ئەدەبی کوردی

بۆ

## پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی

دانانی
لیژنەیەك لە وازەرەتی پەروەردە

پێداچوونەوەی زانستی و بژارکردنی دووەم بۆ هەرچوار بەش

سادق ئەحمەد ڕوستایی | ئەمام جەلال ڕەشید | ئەختەر صدیق حسین
سوزان علی محمد | محسن علی حسین | حسین صابر علی

چاپی هەشتەم | ٢٧١٥کوردی | ٢٠١٥زاینی

**سەرپەرشتی زانستی**

سادق ئەحمەد ڕوستایی

نەمام جەلال رەشید

**سەرپەرشتی هونەری چاپ**

عوسمان پیرداود کواز

خالد سلیم محمود

**نەخشەسازی بەرگ**

ئاری محسین ئەحمەد

**جێبەجێکردنی بژاری هونەری**

شیماء یاسین اکرم

# پێشەکی

وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان – عیراق، لیژنەیەکی بۆ بژارکردنو پێداچوونەوەی زانستی پەرتوکی (زمانو ئەدەبی کوردی) بۆ پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی پێکهێنا. لیژنەکە دەستیکرد بە پێداچوونەوەی هەموو بەشەکانی پەرتوکەکەو بەپێی پێویست وشەو ڕستەی لە هەردوو زاری سەرەکی (کرمانجی سەروو، کرمانجی خواروو)ی زمانی کوردی بۆ قوتابییان هێناوەتەوە. ئەمەش بەو مەبەستەیە، کە زمانی کوردی لە بنچینەدا یەك زمانەو ئەو جیاوازییەی لەنێوان زارەکانیدا هەیە ئەوە نییە، کە ببێتە جێی مەترسی.

پەرتوکەکە لە چوار بەشی سەرەکی پێکهاتووە (ڕێزمان، ڕێنووس، ئەدەب، خوێندنەوە)، بەشی ڕێزمان لە (بیست) بابەتی جیاواز پێکهاتووە، داوا لە مامۆستایانی بەڕێز دەکەین کە بایەخێکی زۆر بە چۆنییەتی گوتنەوەو خستنەڕووی ئەم بەشە بدەن، نمونە لە هەردوو زارە سەرەکییەکە بخەنە بەردەم قوتابییانو داوایان لێبکەن کە تەنیا پشت بە نمونەو ڕستەکانی ئەم پەرتوکە نەبەستن. مامۆستای بەڕێزیش بەپێی پێویست دەتوانێت چەند تێبنییەکی زیاتر لەسەر بابەتەکان بخاتەڕوو.

بەشی ئەدەب تایبەتە بە ژیانو بەرهەمی چەند شاعیرو نووسەرێك. داوا لە مامۆستایان دەکەین لە ڕووی ڕوخسارو ناوەڕۆکەوە بەپێی پێویست بابەتەکان بۆ قوتابییان ڕوونبکەنەوەو داوایان لێبکەن (سێ) دێڕ هۆنراوە، لە نمونەی هەر شاعیرێك ئەزبەر بکەن. نمونەی پەخشانیش دەخوێندرێتەوەو گفتوگۆی لەسەر دەکرێت، بەڵام ئەزبەر ناکرێت.

لە بەشی خوێندنەوەدا بابەتەکان لەلایەن قوتابییان بخوێندرێتەوە، پاشان باس لە واتای وشەو دەستەواژەکان بکرێت. ئینجا لەنێوان مامۆستاو قوتابییان گفتوگۆیەکی کراوە لەسەر ناوەڕۆکی بابەتەکە ئەنجامبدرێت.

بێگومان هیچ کارێك بێ کەموکورتی نابێت، داوا لە مامۆستایانی بەڕێز دەکەین لە ڕێگای بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی پارێزگاکانیان لە کەموکورتی کتێبەکەو تێبینیو پێشنیازەکانیان ئاگادارمان بکەنەوە.

لەگەڵ ڕێزماندا.

لیژنەی بژارکردنو پێداچوونەوەی زانستی

٢٠١٥/٣/٣١

## بەشی ڕێزمان

(وانەی یەکەم)

# ناو لە ڕووی ڕەگەزەوە

**مامۆستای وانەی جوگرافیا لە باسی (سامانی ئاژەڵ)دا گوتی:**

**(سامانی ئاژەڵ، هاوشان دگەل سامانی کشتوکاڵ و چاندن، بەردی بناغەی ئابوری وڵات پێکدەهێنن لە کوردستاندا، دوو جۆرە سامانی ئاژەڵ هەیە، یەکیان ئەو ئاژەڵانەن، کە مرۆڤ بەخودانیان دەکات و سوودیان لێوەردەگرێ، ئەوەی دیکەیان ئەو ئاژەڵانەن، کە لە دەشتودەرو شاخ و چیاکان دەژین و مرۆڤ خودانێ وان نییە، ئەوژی دبێژنێ ئاژەڵی کیڤی[1].**

**مەر، بزن، میهـ، پەز، توشتیر، بەلەندیر، گیسك، کاڤر، بەرخەنێر، بەرخەمێ، گا، مانگا، چێڵ، هەسپ، ماین و هێستر، هەروەها پەلەوەری وەك مریشك و کەڵەشێرو مراوی و قازو گەلێکی دیکە جۆری یەکەم دەگرێتەوە. شڤان و گاوان بەشێك لەو ئاژەڵانە بە خودان دەکەن. مام پیرۆت شڤان و خاڵ سیامەند ژی گاوانێ گوندێ مەنە. نازدارا دایکا پوشۆی بێریڤان و شیردۆشە.**

**جۆری دووەم، ئاژەڵی کێوییە، وەك: بزنە کێوی، ئاسك و مامز، هرچ، ڕێوی، گورگ، یەکانەو مالۆس، پەزکیڤی، کەو، پۆرو قەتێ و سوسکەو گەلێکی دیکە، پێویستە سامانی ئاژەڵ بایەخی پێبدرێت، چونکە گەشەکردنی ئەو سامانە مایەی بەرەوپێشچوونی باری ئابوری وڵاتە.**

[1]- کیڤی : کێوی

## خستنەڕوو:

لەم نووسینەدا، ژمارەیەك ناو هەیە، كە ئەگەر لێیان وردبینەوە، دەبینین لە ڕووی ڕەگەز جیاوازییان هەیە.

كۆمەڵێك لەو ناوانە تەنیا بۆ ڕەگەزی نێر بەكاردێن‌و نكارین بە هیچ جۆرێك بۆ ڕەگەزی دیكە بەكاریان بهێنین، وەك: (گا، بەران، یەكانە، هەسپ، كەڵەشێر، پیرۆت، سیامەند، شڤان، گاوان، باب، خال... هتد). ئەو جۆرە ناوانە پێیان دەگوترێ (ناوی نێر).

كۆمەڵێكی دیكەی ئەو ناوانە هەر بۆ ڕەگەزی مێ دهێنە بەكارهێنان‌و تایبەتن بەو ڕەگەزە، وەك: (مەر، توشتیر (چوشتیر)، بەلەندیر (بەردیل)، مالۆس، مانگا، چێڵ، بزن، نازدار، دایك، بێریڤان، مریشك ) ئەو جۆرە ناوانە پێیان دەگوترێ (ناوی مێ).

هەر لەم نووسینەدا هەندێ ناومان بەرچاو دەكەوێت، كە لەیەك كاتدا دەتوانین بۆ نێرو مێ بەكاریان بهێنن، واتە ئەو ناوانە خودانی دوو ڕەگەزن، بۆیە پێیان دەگوترێ ناوی (دوو لایەن) وەك: (مرۆڤ، مراوی، بەرخ، كاور (كاڤر)، ئاسك (مامز)، هرچ، ڕێوی، گیسك، هێستر، كەو... هتد).

كۆمەڵێكی تری ناومان بەرچاو دەكەوێت، كە بەر هیچ یەك لەم ناوانەی پێشوو ناكەون‌و ڕەگەزیان نییە، لەبەر ئەوە پێیان دەگوترێ (ناوی بێ لایەن) وەك:(بەرد، دەشت، شاخ، چیا، وڵات )و زۆری دیكە. ئەمە لە زاری كرمانجی خواروو، بەڵام لە زاری كرمانجی سەروودا ئەو ناوانەش بەر ناوی (نێر) یان (مێ) دەكەون.

زۆرجار دەتوانین هەندێك لەم ناوە دوو لایەنانە بەهۆی بەكارهێنانی پەیڤێك، بكەین بە (نێر) یان (مێ). ئەم پەیڤانەی بۆ ئەم مەبەستە بەكاردێن بریتین لە (نێر، مێ، ما، دێڵ، گۆڵ ) وەك:

| ناوی دوو لایەن | بۆ نێر | بۆ مێ |
|---|---|---|
| كەو | نێرە كەو | ماكەو، مێ كەو |
| ورچ (هرچ) | نێرە ورچ | دێڵە ورچ، (دەڵە ورچ)، هرچامێ |
| سەگ | گۆڵە سەگ | دێلە، (دەڵە) سەگ |
| گیسك | گیسكی نێر | گیسكامێ، گیسكە مێ |
| پڵنگ | پڵنگی نێر | پڵنگا مێ، پڵنگی مێ |

## دەستور:

**ناو لە ڕووی ڕەگەزەوە دەكرێ بە چوار جۆر:**

**١. ناوی نێر: ئەو ناوەیە، كە هەر لە بنەڕەتدا بۆ ڕەگەزی نێر بەكاردێت، ئەو جۆرە ناوە بۆ ئەم كۆمەڵانە دابەش دەبێت:**

**ئـ- ناوی كەسانی نێرینە، وەك:( پیاو، كوڕ، مام، خاڵ، باوك، برا، پسمام)**

**ب- ناوی تایبەت بە كوڕان، وەك:(شێركۆ، لەزگین، پیرۆت، سیامند)**

**پ- ناوی گیانداری نێر، وەك:(ئەسپ، كەڵەشێر، یەكانە، نێری، بەران)**

**ت- ناوی هەندێ پیشەی پیاوانە، وەك:(نانەوا، شڤان، گاوان، سەپان)**

٢. **ناوی مێ:** ئەو ناوەیە، کە هەر لە بنەڕەتدا بۆ ڕەگەزی مێ بەکارهاتبێت، ئەویش بۆ ئەم کۆمەڵە وشەو پەیڤانە دابەش دەبێت:

ئـ- **ناوی کەسانی مێینە، وەك:** دایك، خوشك، کچ، دۆتمام، خەسوو، بوك.

ب- **ناوی تایبەتی کچان، وەك:** نازدار، شیرین، هێرۆ، پەروین.

پ- **ناوی گیانداری مێ، وەك:** ماین، بەلەندیر، مالۆس.

ت- **ناوی هەندێ پیشەی ژنانە، وەك:** نانکەر، بێریڤان، تەشیڕێس، مامان (داپیرك)، دایەن.

٣. **ناوی دوو لایەن:** ئەو ناوانەن، کە بۆ نێر و مێ بەکاردێن، وەك: قوتابی، مامۆستا، مرۆڤ، کۆتر، کەو، خزمەتکار.

دەتوانین بەشێك لەو ناوە دوولایەنانە بەهۆی پەیڤەکانی (نێر - مێ - ما - دێڵ - گۆڵ ) بکەین بە ڕەگەزی نێر یا مێ.

٤. **ناوی بێلایەن:** ئەو ناوانەن کە سەر بە هیچ کام لەو دوو ڕەگەزە نین و هەر لەبنەڕەتدا ڕەگەزییان نییە. وەك: (شاخ، چیا، بەرد، دار، هەنار)، هەر چەندە لە زاری کوردی کرمانجی ژووروودا ئەم جۆرەش لە دانە پاڵدا بەر یەك لە دوو ڕەگەزی (نێر) یان (مێ) دەکەوێت.

## ڕاهێنانی (١)

لەم ناوانە، ناوی نێرو مێ لێك جیابکەوەو بەرامبەر یەکیان دابنێ:

(ئەسپ، مریشك، نێری، چێڵ، برا، ماین، ئێکانە، خوشك، مـالۆس ، کەڵەشێر، بزن، گا )

## ڕاهێنانی (٢)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

کەو : (مێیە، نێرە، بێلایەنە، دوولایەنە)

سەگ : (بێلایەنە، دوولایەنە، مێیە، نێرە)

هرچ : (نێرە، مێیە، بێلایەنە، دوولایەنە)

ڕویڤی : (مێیە، نێرە، بێلایەنە، دوولایەنە)

گەماڵ : (دوولایەنە، نێرە، بێلایەنە، مێیە)

هەنگ : (بێلایەنە، مێیە، نێرە، دوولایەنە)

مانگا : (مێیە، بێلایەنە، نێرە، دوولایەنە)

ئاسك : (مێیە، نێرە، بێلایەنە، دوولایەنە)

شاخ : (دوولایەنە، نێرە، بێلایەنە، مێیە)

کاوڕ : (بێلایەنە، نێرە، دوولایەنە، مێیە)

یەکانە : ( مێیە، بێلایەنە، نێرە، دوولایەنە)

بەرد : (دوولایەنە، بێلایەنە، نێرە، مێیە)

(وانەی دووەم)

# نیشانە تایبەتییەکانی نێرو مێ

١. بابێ ئازادی ئەندازیارە.

٢. خوشکا سەرداری چوو خوێندگەهێ.

٣. خانییێ من گەلەك مەزن و تازەیە.

٤. زەڤییا بەرمالا بەراڤە.

٥. دۆستێ تە هات ژ دهۆکێ.

٦. دۆستا من گەلەك ڕندو جوانە.

٧. کوڕۆ، بخوێنن دا سەرکەڤن.

٨. شرینێ، چێلێ بدۆشە.

٩. کوڕە، ئەم کارە مەکە.

کچێ، وانەکانت چاك بخوێنە.

١٠. کوڕینە (کچینە) ئەم کارە مەکەن.

١١. ڤی قەلەمی بۆ من بکرە.

ڤێ دەفتەرێ بۆمن بهینە.

وی کوڕی کەوەك گرت.

وێ کچێ کراسەك دووری.

١٢. سەرداری شیڤ خار

نازدارێ تەشی ڕێست

## خستنەڕوو:

ئەگەر سەرنجی ئەم ڕستانە بدەین، دەبینین هەندێ لە ناوەکان نیشانەی وایان وەرگرتووە، کە دەتوانین بەهۆیانەوە ڕەگەزی ناوەکە بزانین:

١. لە ڕستەی یەکەمدا نیشانەی (ێ) خراوەتە سەر ناوی (باب) لە دۆخی دانە پاڵدا، چونکە ڕەگەزی باب نێرەو لەم دۆخەدا (ێ)ی دەخرێتە سەر.

٢. کەچی دەبینین لە ڕستەی دووەمدا نیشانەی (ا) خراوەتە سەر پەیڤی (خوشك)، چونکە ڕەگەزی پەیڤەکە (مێ)یەو لەم دۆخەدا نیشانەی (ا)ی دەدرێتە پاڵ.

٣. هەروەها لە ڕستەی سێیەمدا پەیڤی (خانی) واتە (خانوو)، چونکە لە ڕەگەزدا نێرە (لە زاری کرمانجی ژووروودا) بۆیە لە دۆخی دانەپاڵدا (ێ)ی وەرگرتووەو بووە بە (خانیێ من).

٤. کەچی لە ڕستەی چوارەمدا، چونکە پەیڤی ( زەڤی– زەوی) لە ڕەگەزدا مێیە، بۆیە لە دۆخی دانەپاڵدا (ا)ی پێوە نووساوەو بووە بە (زەڤیا بەرمالا ) واتە زەوی بەرماڵان.

٥. ئەگەر سەرنج لە ڕستەی پێنجەم و شەشەم بدەین، دەبینین وشەی (دۆست) دوو لایەنە، واتە بۆ نێرو مێ بەکاردێت، بەڵام بۆ دەستنیشانکردنی ڕەگەزەکەی، لە دۆخی دانەپاڵدا بۆ نێر (ێ)ی دەخرێتە سەرو دەبێتە (دۆستێ سەرداری) واتە ڕەگەزی

دۆستەکە نێرە، بۆ (مێ) نیشانەی (ا)ی دەخرێتە سەرو دەبێتە (دۆستا من) واتە ڕەگەزی دۆستەکەی من مێیە.

٦. لە ڕستەی حەفتەمدا نیشانەی (ۆ) خراوەتە سەر و پەیڤی (کوڕ) لە دۆخی بانگکردندا، چونکە ڕەگەزی کوڕ نێرە.

٧. کەچی لە ڕستەی هەشتەمدا چونکە ڕەگەزی (کچ) مێیە، لەبەر ئەوە لە دۆخی بانگکردندا نیشانەی (ێ)ی دەخرێتە سەر.

٨. لە ڕستەی نۆیەمدا هەر پەیڤی (کوڕ) لە دۆخی بانگکردندا نیشانەی (ە)ی خراوەتە سەرو بووە بە (کوڕە)و وشەی کچیش هەر لەم دۆخەدا (ێ)ی پێوە نووساوەو بووە بە (کچێ). ئەم دوو نیشانەیە لە زاری کرمانجی خوارووودا بەکاردێن.

٩. ئەگەر ناوە بانگکراوەکە (کۆ) بوو، نیشانەکە بۆ هەردوو ڕەگەز دەبێتە (ینە) وەکو ڕستەی دەیەم: (کوڕینە، کچینە، ئەم کارە مەکەن).

١٠. لە ڕستەکانی ژمارە (یازدە)دا هاوەڵناوی نیشانەی (ڤی... ی) بۆ تاکی ڕەگەز نێری نزیك بەکارهاتووە، لە ڕستەی (ڤی قەلەمی بۆمن بکڕە)، ئینجا (ڤێ... ێ) بۆ تاکی ڕەگەز مێی نزیك بەکارهاتووە، لە ڕستەی (ڤێ دەفتەرێ بۆ من بهینە) چونکە ڕەگەزی (دەفتەر) مێیە.

١١. بۆ تاکی نێری دووریش هاوەڵناوی نیشانەی (وی... ی) لە ڕستەی (وی کوڕی کەوەك گرت) بەکارهاتووە هاوەڵناوی

(وێ... ێ) بۆ تاكی مێی دوور، لە ڕستەی (وێ كچێ كراسەك دووری) بەكارهاتووە.

١٢. لە ڕستەی (سەرداری شیف خار)دا، چونكە كاری ڕستەكە ڕابردووی تێپەرە، بۆیێ نیشانەی (ی) خراوەتە سەر ناوە نێرەكەو نیشانەی (ێ) لە ڕستەی (نازدارێ تەشی ڕێست)دا خراوەتە سەر ناوە مێیەكە، كە لەو ڕستەیەشدا كاری (ڕێست) ڕابردووی تێپەڕە، دەبێت ئەوەش بزانین كە ناوی (كۆ) نیشانەی نێرو مێ وەرناگرێت.

## دەستور:

**لەزاری كوردی كرمانجی ژووروودا، چەند نیشانەیەك هەن دەخرێنە سەر ناو، بۆ جوداكردنەوەی ناوی نێرو ناوی مێ.**

**نیشانەكان بەم جۆرە بەكاردێن:**

**١. لە دۆخی دانەپاڵدا:**

**ئـ- نیشانەی (ێ- یێ)[1] بۆ نێر بەكاردێت، وەك: (برایێ من)، (هەڤاڵێ تە).**

**ب- نیشانەی (ا – یا ) بۆ مێ بەكاردێت، وەك: (كچا سەربەستی).**

**٢. لە دۆخی بانگكردندا بۆ نێر نیشانەی (ۆ) بەكاردێت، وەك: كوڕۆ- بابۆ. بۆ (مێ) نیشانەی (ێ) بەكاردێت، وەك: (كچێ، دەلالێ)**

[1] –پیتی (یـ) كە لە نێوان (ێ،ا) و وشەكە دێت ناوبەندە، كە وشە كۆتایی بە بزوێن هات (یێ، یا) وەردەگرێت.

لە زاری کرمانجی خواروو‌شدا نیشانەی (ە) بۆ نێر بەکاردێت وەك (کوڕە)، نیشانەی (ێ) بۆ مێ بەکاردێت وەك (کچێ). بۆ ناوی کۆی نێرو مێ (ینە) بەکاردێت وەك (کوڕینە، کچینە).

٣. هاوەڵناوی نیشانە بۆ نێرو مێ لە زاری کرمانجی ژووروو‌ودا بەم جۆرەیە:

ئـ- (ڤی ... ی) بۆ تاکی نێری نزیك.

ب- (ڤێ ...ێ) بۆ تاکی مێی نزیك.

پ- (وی ... ی) بۆ تاکی نێری دوور.

ت- (وێ ... ێ) بۆ تاکی مێی دوور.

٤.

ئـ- (ئەڤان ... ان) بۆ کۆی نزیکی نێرو مێ

ب- (وان ... ان) بۆ کۆی دووری نێرو مێ بەکاردێن.

٥. لە ناوی تایبەت نیشانەی:

(ی) بۆ نێرو (ێ) بۆ مێ بەکاردێن، وەك:

ئـ. بۆ نێر : لەزگینی دەرس نڤیسی.

ب. بۆ مێ : شرینێ پەز دۆشی.

## ڕاهێنانی (١)

ئەم ناوانە لە دۆخی دانەپاڵدا لە ڕستە بەکاربهێنە، پاشان ڕەگەزەکانیان بنووسە:

(ئاڤ، ڕەز، چاڤ، ڕوبار، ماڵ)

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ناوانە لە دۆخی بانگکردندا لە ڕستە بەکاربهێنە:

(لاوان، ژن، کیژ، قوتابییان، خاڵ)

## ڕاهێنانی (٣)

١. لە دۆخی دانەپاڵدا ناوی ڕەگەزی مێ چ نیشانەیەك وەردەگرێ؟

٢. لە دۆخی دانەپاڵدا ناوی ڕەگەزی نێر چ نیشانەیەك وەردەگرێ؟

٣. لە دۆخی بانگکردندا ئەگەر ناوەکە تاکی نێر بوو، لە زاری کرمانجی ژووروودا کام نیشانە وەردەگرێو لە کرمانجی خوارووشدا کامە؟

٤. جێناوی نیشانەی (ڤان) بۆچیو (وان) بۆچی بەکاردێن؟

## ڕاهێنانی (٤)

(هاوەڵناوی نیشانە)ی تاکی نزیكو دوور بدە پاڵ ئەو ناوانە لە ڕستەدا، ئینجا ڕەگەزی ناوەکان بنووسە:

(دەرگە، کچ، جامێر، ماهین، گوند)

## ڕاهێنانی ( ٥ )

١. له دانەپاڵدا نیشانەی نێرو مێ چین؟ نمونەی ڕستەییان بۆ بهێنەوە.

٢. ئەگەر ناوەکە تایبەت بێت، نیشانەکانی نێرو مێ کامانەن، نمونەی ڕستەییان بۆ بهێنەوە.

٣. هاوەڵناوی نیشانە بۆ تاکی مێی نزیك چییە؟ نمونەی ڕستەیی بۆ بهێنەوە.

٤. هاوەڵناوی نیشانەی تاکی نێری دوور چییە؟ نمونەی ڕستەیی بۆ بهێنەوە.

## ڕاهێنانی ( ٦ )

**شلۆڤەکردن:**

برایێ ئازادی هات.

برا : ناوە، تاکە، گشتییە، نەناسراوە، بکەرە.

یێ : ئامرازی دانەپاڵە بۆ تاکی نێر.

ئازاد: ناوە، تاکە، تایبەتییە، تەواوکەری ناوی برایە.

ی: نیشانەی ڕەگەزی نێری تاکە.

هات: کاری ڕابردووی نزیکە، سادەیە، تێنەپەڕە.

ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

١. ڤێ کچێ نان خار.

٢. کچینە وانەکە بخوێنن.

# ناوی نەناسراو - ناوی ناسراو

## ئـ- ناوی نەناسراو

١. کچێك دەرگای ماڵی ئێمەی کردەوەو هاتە ژوورەوە.

کچەکێ دەرگەهێ مالا مە ڤەکرو هات ژوورڤە.

٢. کە چاوم پێت کەوت تووشی دەریاییەك (دەریایەك، دەریایێ) خەفەت و پەژارە بووم.

چووینە دێیێك (دێیەك، دێیێ) لەبناری چیای قەندیل.

کانیێکی (کانیەکی، کانیێ) خۆش لە گوندەکەمان هەیە.

هەڵۆییەك (هەڵۆیەك، هەڵۆییێ) لە ئاسماندا نێچیرێکی گرتبوو.

پەنجەرەییەك (پەنجەرەیەك، پەنجەرەیێ) لە ژووری سەرەوە شکابوو.

٣. داربەڕوویێك (داربەڕووەك، داربەڕووێ) لەو دارستانە وشکبووە.

٤. ڕۆژانێك (ڕۆژانەك، ڕۆژانێ) مرۆڤ لە ئەشکەوتان دەژیا.

## خستنەڕوو:

ئەگەر ڕستەکان بە وردی بخوێنینەوە، دەبینین:

١. لەڕستەی یەکەمدا کە ناوی (کچێك- کچەك- کچێ) دەهێنین، مەبەستمان تاکە کچێکەو ئەو کچەش نەناسراوەو تاکیشە.

٢. لە ڕستەی دووەمدا کە دەبێژین (دەریاییێك، دەریایەك، دەریایێ) مەبەست ئەوەیە، دەریایەکە هەم تاکە هەم نەناسراویشە واتا هەردوو نیشانەی یا هەردوو سیفەتی تاکایەتی و نەناسراویی پێوەیە.

٣. هەر بەم جۆرە لە ڕستەکانی دیکە کۆمەڵە ناوێك دەبینین، کە بەڕیز بریتین لە:

دێییێك، دێیەك، دێیێ

کانییێك، کانیەك،کانیێ

هەڵۆییێك، هەڵۆیەك، هەڵۆییێ

پەنجەرەییێك، پەنجەرەیەك، پەنجەرەیێ

ئەم ناوانە وەکو ئەوانی پێشوو هەموویان هەم تاکایەتیو هەم نەناسراویی پیشاندەدەن، ئەو پیشاندانەش بەهۆی نیشانەیەك کراوە کە بریتییە لە (ێك، ەك، یێ).

٤. لە ڕستەی ژمارە (٣)شدا، ناوی داربەڕوو، بووە بە (داربەڕووێك، داربەرووەك، داربەڕوویێ) کە هەر هەمان مەبەستی نە ناسراویی وتاکایەتی دەبەخشێ.

٥. لە ڕستەی ژمارە (٥) داناوی (ڕۆژانێك، ڕۆژانەك، ڕۆژانێ) ناوێکە نەناسراویی پیشان دەدا بەڵام تاك نییە، بەڵکو بەهۆی نیشانەی (ان) کۆکراوەتەوەو نیشانەکە خراوەتە دوای ناوەکە پێش نیشانەی (ێك) کە بۆ نەناسراوی بە کارهاتووە، کەواتە ئەم نیشانەیە دەخرێتە سەر ناوی کۆ هەروەکو چۆن لەگەڵ تاکیشدا بەکاردێت.

## دەستور:

١. نیشانەی نەناسراوی لە زمانی کوردیدا، جگە لە پیشاندانی نەناسراوی تاکایەتیش پیشاندەدات، هەرچەندە جاروبار دەخرێتە سەر ناوی (کۆ)ش.

٢. نیشانەکە یەك لەم شێوانە وەردەگرێ:

(ێك، ەك، ێ)، کە دەخرێتە سەر ناو و دەیکات بە ناوی نەناسراو بەم جۆرە:

ئـ- ئەگەر ناوەکە کۆتایی هاتبوو بە پیتی نەبزوێن، یەکسەر نیشانەی (ێك، ەك، ێ) دەخرێتە سەر ناوەکە، وەك:

پیاو= پیاوێك، پیاوەك، پیاوێ

دار = دارێك، دارەك، دارێ

ب- ئەگەر ناوەکە کۆتایی هاتبوو بە بزوێنەکانی (ا، ێ، ی، ۆ، ە) لە نێوان ناوەکەو نیشانەکە ناوبەندی (ی) پەیدا دەبێت، وەك:

چیا + ی+ نیشانەکە= چیایێك، چیایەك، چیایێ

زێ + ی+ نیشانەکە= زێیێك، زێیەك، زێیێ

ماسی+ ی+ نیشانەکە= ماسییێك، ماسییەك، ماسییێ

پەڕۆ+ ی + نیشانەکە = پەڕۆیێك، پەڕۆیەك، پەڕۆیێ

پەڕە+ ی + نیشانەکە = پەڕەیێك، پەڕەیەك، پەڕەیێ

پ- ئەگەر ناوەکە کۆتایی هاتبوو بە بزوێنی (وو)، ناوبەندی (و) لەنێوان ناوەکەو نیشانەکە دادەنرێ، بزوێنی (وو) ئەو کاتە لە دەربڕیندا کورتتر خۆی پیشاندەدات، وەك:

بەڕوو + و + نیشانەکە= بەڕووێك، بەڕووەك، بەڕووێ[1].

٣. ناوی نەناسراو (ان)ی نیشانەی کۆکردنەوەی ناو وەردەگرێتو ئەو نیشانەیە دەکەوێتە نێوان ناوەکەو نیشانەی نەناسراویەوە، وەك:

کەس+ ان+ نیشانەکە= کەسانێك، کەسانەك، کەسانێ.

## ب- ناوی ناسراو

(دارەکە زۆر بڵند بوو، کەس ژمە نەشیاین بچینە سەری، باخەوانەکە خۆی هەنارە شیرینەکەی بۆمان لێکردەوە، هەروەها لە دار هەرمێکە و لە هەڵووژەکە هەندێکی بۆ لێکردینەوە.

میوانەکانمان بردو چووینە سەر کانییەکە، ل وێرێ ڕوونیشتین و دەستمانکرد بە میوەخواردن، ئاوی کانییەکە گەلێك سارد بوو، تەنانەت بادیە دۆیەکەی لەناو ئاوەکە دانرابوو ساردو تەزیبوو.

جوتیاری برای باخەوانەکە لەژێر داربەڕووەکەدا بەرامبەر چیاکە پاڵ کەوتبوو و تەماشای ئێمەی دەکردو خۆزی ئەوەی دەخواست کە لەو ڕوونیشتنە لەگەڵمان بووایە، لەپڕ مارێکمان لێدەرکەوت، ویستمان بیکوژین، مارە بۆی دەرچوو، لەدەستمان ڕزگاری بوو).

---

(١) دەبوایە بەسێ واو بنووسری، بەڵام کە ناو کۆتایی بە بزوێنی (وو)دێت، کە نیشانەی نەناسراوی وەردەگرێت (وو) خۆی کورت دەکاتەوە بۆ(و) ناوبەندی (و)ش دەچێتە نێوانیان.

## خستنەڕوو:

لە خوێندنەوەی ئەم نووسینەدا، ژمارەیەك ناو دەبینین، کە هێلیان بە ژێردا کێشراوە، ناوەکان بۆیە هێلیان بەژێردا هاتووە، چونکە هەر یەکە نیشانەیەکی تایبەتی خراوەتە سەر بۆ ئەوەی مەبەستێك دەربڕێ.

بۆ نمونە ئەگەر تەماشای ناوەکانی:

(دارەکە، باخەوانەکە) بکەین لە بنەڕەتدا ئەم دوو ناوە لەشێوەی (دار، باخەوان)دا بوون، کە هەردووکیان بە پیتی نەبزوێن کۆتاییان هاتووە، ئێمەش هاتووینو نیشانەی (ەکە)مان خستووتە سەریان بۆ ئەوەی بیانکەین بەناوێکی ناسراو، وەك: (دارەکە، باخەوانەکە).

دیارە جیاوازی لەنێوان (دار، دارەکە)و (باخەوان، باخەوانەکە)دا هەیە، لەوەدا کە (دار) ناوێکی گشتییەو بەسەر هەموو جۆرە دارێکدا دابڕاوەو جۆرە دارێکی دیارو ئاشکراو ناسراو دەستنیشان ناکات، بەڵام (دارەکە)، دارێك دەستنیشان دەکات کە لەمەوبەر لامان ئاشکراو دیارو ناسراو بووە، کە گوتمان (دارەکە) یەکسەر بیرو هۆشمان بۆ لای دارێك دەچێت کە لەمەو پێش ناسیومانەو دەزانین کامەیە، بۆیە نیشانەی (ەکە) ناوەکەی بۆ کردین بە ناوی ناسراو، هەروا (باخەوان، باخەوانەکە)ش.

ناوی (دارهەرمێکە) کە لە بنەڕەتدا (دارهەرمێ) کۆتایی بە بزوێنی (ێ) هاتووە، بەهۆی نیشانەی (ەکە)وە کردوومانە بە ناوێکی ناسراو، هەروەکو گوتمان چونکە ناوەکە کۆتایی بە بزوێن هاتووە، بۆیە (ە)ی سەرەتای نیشانەکە تێدەچێتو دەبێتە (هەرمێکە).

هەر بەم جۆرەش ناوەکانی:

دۆ، دۆیەکە

چیا، چیاکە

هەر یەکەیان بەهۆی نیشانەی (ەکە)وە کراون بەناوی ناسراو، بەڵام چونکە ناوەکان لە بنەرتدا کۆتاییان بە بزوێن هاتووە، بۆیە (ە)ی سەرەتای نیشانەی (ەکە)، یان تێدەچێت.

هەر ناوێکیش، کە کۆتایی بە بزوێنی (ی) هاتبێت وەکو (کانی)، کە دەکرێ بە ناسراو و نیشانەی (ەکە)ی دەخرێتە سەر، نەبزوێنی (ی) پێویستە ببێت بە ناوبەند لە نێوان پیتی (ی) کۆتایی ناوەکە، کە بزوێنەو پیتی (ە)ی نیشانەکە دابنرێ، وەکو:

کانی دەبێتە (کانییەکە).

ماسی دەبێتە ( ماسییەکە).

ناوی (هەڵۆژەکە) کە لە بنەڕەتدا بریتیە لە (هەڵۆژە) کۆتایی بە بزوێنی (ە) هاتووە، کە دەیکەین بە ناوێکی ناسراو بە هۆی نیشانەی (ەکە)، ئەوا نیشانە نەناسراوی(ە)ی تێدەچێت.

هەروەها ناوی (داربەڕووەکە)، ئەم ناوە لە بنەڕەتدا کۆتایی بە بزوێنی (وو) دێت، کاتێك، کە نیشانەی (ەکە)ی ناسراوی دەخرێتە سەر، ئەوا پیتی نەبزوێنی (و– W ) لەنێوان ناوەکەو نیشانەکەدا پەیدا دەبێتو بزوێنی (وو) لەکاتی دەربڕیندا کەمێك لەباری ئاسایی خۆی کورتتر دێتە گۆتن.

هەر لە نووسراوەکەدا ڕستەیەك بەم جۆرە هاتووە (لە پڕ مارێکمان لێدەرکەوت، ویستمان بیکوژین، مارە بۆی دەرچوو).

لەم ڕستەیەدا ناوی (مارە) ناوێکی ناسراوەو بەهۆی نیشانەی (ە)، کە ئەویش نیشانەی ناسراوی ناوە، کراوە بەناوی ناسراو، لەوانەشە ئەم نیشانەیە کورتکراوەی نیشانەی (ەکە) بێت.

ناوی ناسراوی بەرجەستە هەر تاك نایێت، بەڵکو هەموو ناوێکی ناسراو بەهۆی نیشانەی (ان)ی کۆ، کۆدەکرێتەوە، نیشانەکە دەخرێتە دوای (ەکە)و ناوەکە دەبێتە ناسراوی کۆ، وەك لە ڕستەی (میوەکانمان بردو چووینە سەرکانییەکە)دا دەردەکەوێت.

هەندێ جار نیشانەی ناسراوی دەکەوێتە سەر هاوەڵناوەوە، بەڵام لەو بارەشدا ئەو ناوەی لەگەڵ هاوەڵناوەکەدا دێت، هەر بە ناوێکی ناسراو دادەنرێت، وەك (باخەوانەکە خۆی هەنارە شیرنەکەی بۆمان لێکردەوە) دا دەردەکەوێت. کە لێرەدا نیشانەی (ەکە)ی ناسراوی خراوەتە سەر هاوەڵناوی (شیرین) نەك ناوی (هەنار)، بەڵام ناوی هەناریش دەبێتە ناوێکی ناسراو، هەر چەندە نیشانەکە لەسەر هاوەڵناوەکەیە.

## دەستور:

ناوی ناسراو، ناوێکە کە ماناو مەبەستی شتێك دەردەخات و بە ناسراوی دەیخاتە ڕوو، بە ئاسانی لە هاوچەشنەکانی خۆی جیایدەکاتەوە، چونکە ناوێکی دیاریکراوی زانراو دەردەخات.

نیشانەی سەرەکی ناسراوی (ەکە)[1]یە بەم جۆرە بەکاردێت.

١. ئەگەر ناوەکە کۆتایی بە نەبزوێن هاتبوو، یەکسەر نیشانەکەی دەخرێتە سەر.

٢. ئـ- ئەگەر ناوەکە بە بزوێنەکانی (ا، ۆ، ێ، ە) کۆتایی هاتبوو و لە یەك بڕگە پێکهاتبوو، ئەوە ناوبەندی (ی- y) وەردەگرێت.

ب- ئەگەر ناوەکە کۆتایی بە بزوێنی (ا، ۆ، ێ، ە) هاتبوو و لە بڕگەیەك زیاتر بوو، بزوێنی (ە)ی کۆتایی نیشانەکە تێدەچێت .

٣. ئەگەر ناوەکە بە بزوێنی (ی) کۆتایی هاتبوو ، ئەوا لەنێوان ناوەکەو نیشانەکە (ی - y ) نەبزوێن وەك ناوبەند دادەنرێت.

٤. ئەگەر ناوەکە بە بزوێنی (وو) کۆتایی هاتبوو، پیتی نەبزوێنی ( و - W ) وەکو ناوبەند دەخرێتە نێوان ناوەکەو نیشانەکە.

٥. زۆرجار نیشانەی (ە) بۆ ناسراوی بەکاردێت کە ڕەنگبێت کورتکردنەوەی (ەکە) بێت، وەك کوڕە هات - کچە دەرچوو.

---

[1]– *هەموو ناوێکی تایبەتی ناسراوە، وەك: کەرکوك، ئازاد، پەروین.

* هەر ناوێك لەگەڵ نیشانەی ناسراوی هات دەبێتە ناسراو، وەك: ئەم چیایە بڵندە، ئەڤ ڕوبارە درێژە، ئەو شارە خۆشە، وی کوری دەرس خاندییە، وێ کچێ دەرس خاندییە، ڤی زەلامی کارێ خۆ کرییە، ڤێ ژنێ تەشی ڕێسییە.

ناوەکانی (چیا، ڕوبار، شار، کور، کچ، زەلام، ژن) هەموویان ناسراون.

٦. ناوی ناسراو بە نیشانەی (ان) کۆدەکرێتەوە کە دەخرێنە، دوای نیشانەکەوە.

٧. ئەگەر هاوەڵناوێک بەدوای ناوەکە هات نیشانەی (ەکە) دەخرێتە سەر هاوەڵناوەکەو ناوەکەشی هەر دەبێت بە ناسراو.

٨. نیشانەی ناسراوی ناچێتە سەر ناوی تایبەتییەوە، لە بەر ئەوەی هەموو ناوێکی تایبەت لە بنەڕەتدا ناسراوەو کۆ ناکرێتەوە.

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەدا ناوە نەناسراوەکان بگۆڕە بە ناوی ناسراو.

١. ئازاد دەرگایەکی کردەوە.

٢. کتێبێک بکڕە.

٣. دوێنێ مامۆستاییێک چیرۆکێکی بۆ قوتابییان خوێندەوە.

٤. پەریزاد سێوێکی خوارد.

٥. نەوزاد وانە دەخوێنێت.

٦. کوڕێکم دیت.

٧. قەلێك سەلکە پەنیرێکی بە دەنووک هەلگرتبوو.

٨. پار کچێك بە یەکەم دەرچوو.

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستانەدا ناوەکان لەتاکی نەناسراوەوە بکە بە کۆی ناسراو، هەر گۆڕانکارییەکی دی کە بەسەر ڕستەکاندا دێت ئەنجامیان بدە.

١. کراسێکی جوانم کـــــــڕی.

٢. برادەرێکم هاتو سەری لێدام.

٣. دێیێك ئاوەدان دەکەنەوە.

٤. کابرایەك ڕەزێکی کێڵا.

٥. ڕاوکەرێك کەوێکی گرت.

## ڕاهێنانی (٣)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

ڕاستەیەك : (تاکی ناسراوە، کۆی ناسراو، تاکی نەناسراوە)

کوڕە : (تاکی نەناسراوە، تاکی ناسراوە، کۆی نەناسراو)

ڕووبارەکان : (کۆی نەناسراوە، کۆی ناسراوە، تاکی ناسراو)

هەڵەبجە : (تاکی ناسراوە، تاکی نەناسراوە، کۆی ناسراو)

لادێکە : (تاکی ناسراوە، کۆی ناسراو، تاکی نەناسراوە)

لاوانێك : (کۆی ناسراوە، کۆی نەناسراوە، کۆی ناسراو)

پەنجەرەیەك: (کۆی نەناسراو، تاکی ناسراوە، تاکی نەناسراوە)

## ڕاهێنانی (٤)

لەم ڕستانەدا هەر ناوێکی ناسراو هەیە بیکە بە نەناسراو و ڕستەکان بنووسەوە.

١. جانتاکەم دۆزییەوە.

٢. پەپوولەکە لەسەر گوڵەکە نیشتەوە.

٣. چاوم بە پیاوەکە کەوت.

٤. ڕێیەکەمان قیرتاوکرد.

٥. دارستانەکە سووتا.

## ڕاهێنانی (٥)

نمونە:

ئـ- چێڵ    ب- چێڵێك    پ - چێڵەکە    ت- چێڵەکان

ئەم ناوانە وەك (ب، پ، ت ) بنووسە:

(چرا، مانگ، ماسی، زانکۆ، ئاگر، شەپۆڵ)

## ڕاهێنانی (٦)

ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

١. بێریڤانەکە مەڕەکانی دۆشی.

٢. فڕۆکەکە دەنیشێتەوە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| کەس ژمە | : | کەس لە ئێمە، کەس لەمە |
| نەشیاین | : | نەمانتوانی |
| ل وێرێ | : | لەوێ ، لەوێندەرێ |
| بادی | : | جام، کاسە |
| لەپڕ | : | لەناکاو، لەهێکەوە |
| سەلکە پەنیر | : | سەرکە پەنیر |

(وانەی چوارەم)

# ناوی تاك‌و ناوی کۆ

لەسەردەمی ئێستادا کوڕان‌و کچان ڕوو لە قوتابخانان دەکەن، ژنان‌و پیاوان خوێندەوارن، مرۆڤی خوێندەوار پتر خزمەتی وڵات دەکات، جوتیارانی کورد ئەگەر خوێندەوار بوونایە بەرهەم پتر دەبوو، هەر کەسێك کاری تایبەتی خۆی هەیە، ئەندازیاران ڕێیان دروستدەکەن، جوتیاران دار هەرمێیان، دار قەیسییان دەچێنن، دار بەڕووان ناچێنن، چونکە خۆیان لە دارستانان شیندەبن، ڕاوکەران لە ڕوباران ماسییان دەگرن، لە چیاکان بزن‌و نێرییان ڕاودەکەن، بەکێردو چەقۆیان وان ڤەدکوژن، ماسیێت دەریایان گەورەن، دارێن چیایان بلندن، ئەم ل دەڤەرا بەرواریان دژین، گوندێن ڤی دەڤەری گەلەك خۆشن، بەلآم لەزستاندا ساردن، بۆیە پێویستە قوتابییانی ئەوێ پەنجەران داخەن‌و دەرگایان پێوەدەن، تا سەرمایان نەبێت، ئاوی کانییانی ئەو دەڤەرە لە هاویندا تەزی‌و ساردن، باخاتی پڕ لە میوەجاتەو دیمەنی دێهاتی گەلەك جوانە، سەدەها جار لە دیمەنی گوندەکانی شوێنانی دی جوانترە، خەڵکی ڤان گوندا مەڕو پەزو گاگەل بەخێودەکەن، کوڕێد ڤێ دەڤەری هەمی دلسۆزن بۆ وەلاتێ خۆ.

## خستنەڕوو:

١. ئەگەر بە وردی ئەم پارچە نووسینە بخوێنینەوە، بۆمان دەردەکەوێت، کە ژمارەیەك ناوی تێدایە، ئەم ناوانە لە یەکێك زیاتر پیشاندەدەن، وەك: (کوڕان– کچان– ژنان– پیاوان)، کە هەر یەك لەمانە ژمارەیەك پیشاندەدات، کە پتر بێت لە یەك، واتە کە گوتت (کوڕان) دیارە مەبەستت پتر لە یەك کوڕە، یان کە گوتت (کچان) دیسان مەبەستت پتر لە یەك کچە، دیاریشە کە نیشانەی کۆکردنەوەی ئەو جۆرە ناوانە (ان)ە، کە دەخرێتە سەر ناوی تاکی کۆتایی هاتوو بە پیتی نەبزوێن بۆ ئەوەی لە تاکەوە بیکات بە کۆ، ئەم نیشانەیە لە هەردوو شێوە زاری(کرمانجی خوارو و کرمانجی سەروو) نیشانەی سەرەکی کۆکردنەوەی ناوە.

٢. هەر لەناو نووسینەکەدا جۆرە ناوێك هەن، کە تاکەکانیان کۆتاییان دێت بە چەند بزوێنێکی وەکو (ا - ێ - ی - ۆ).

ئەم جۆرە ناوانە ئەگەر بکرێن بە کۆ ئەوا لەنێوان ناوەکەو نیشانەکەدا (ی – y )ی نەبزوێن بەکاردێت، بۆ ئەوەی وەکو ناوبەندێك بکەوێتە نێوان دوو بزوێنەوە، بۆ نمونە هەر لەم پارچە نووسینەدا گەلێك ناوی تاك بەم شێوەیە کراون بە کۆ، وەك:

دار هەرمێ کراوە بەدار هەرمێیان

چیا کراوە بە چیایان

ماسی کراوە بە ماسییان

چەقۆ کراوە بە چەقۆیان

گەلێکی دیکەش.

٣. دیسان ئەگەر چاك لە نووسینەکە وردبینەوە، ناوی وامان بەرچاو دەکەوێت، کە تاکەکانیان بە بزوێنی (وو) کۆتاییان دێت، کە کۆمان کردووتەوە لەنێوان ناوەکەو بزوێنەکە، ناوبەندی ( و– W ) بەکارهاتووە، لە خوێندەوەشدا دەنگی بزوێنی (وو) کەمێك لە باری ئاسایی کورتتر دهێتە گۆتن، وەك:

(داربەڕوو) کە کۆدەکرێتەوە دەبێت بە (داربەڕووان).

(مازوو) کۆ دەکرێتەوە دەبێت بە (مازووان)

٤. ئەو ناوە تاکانەی کە کۆتاییان بە بزوێنی (ە) دێت، ئەگەر لە بڕگەیەك زیاتر بن، کە دەکرێنە کۆ نیشانەی (ان) بەکاردێتو بزوێنی (ە) تێدەچێت، وەك:

(پەنجەرە) کراوە بە (پەنجەران)

(قوتابخانە) کراوە بە (قوتابخانان)

بەلاّم ئەگەر ناوەکە لە بڕگەیەك پێکهاتبوو ئەوا ناوبەندی (ی–y) لە نێوان ناوەکەو نیشانەی کۆ وەك : شە ـ شەیان.

٥. لە دەقەکەدا هەندێ ناوی دیکەمان بەرچاو دەکەوێت، کە لەکاتی کۆکردنەوەیاندا هەندێ نیشانەمان بەکارهێناوە بۆ کۆ، وەك: نیشانەکانی:

ئـ– (ات، هات، جات ) لە پەیڤەکانی (باخ ← باخات) (دێ← دێهات) (میوە ← میوەجات).

ب– ەها: وەك (جار– جارەها ) (سالّ– سالّەها)

که دیاره ئه‌م نیشانانه زۆر که‌م به‌کاردێن.

پ- گه‌ل: که به‌زۆری ده‌خرێته سه‌ر ناوی گیانله‌به‌رو جانه‌وارانه‌وه، ده‌بن به کۆ، وه‌ك: (گا ← گاگه‌ل) (سه‌گ ← سه‌گ گه‌ل)

٦. هه‌ندێ ناوی دیکه له نووسینه‌که‌دا به‌رچاو ده‌که‌ون، که شێوه‌ی کۆیان به خۆوه گرتووه، بێ ئه‌وه‌ی نیشانه‌ی (ان) خرابێته سه‌ریان، به‌ڵکو نیشانه‌کانی (ێن- ێت- ێد) خراوه‌ته سه‌ریان بۆ ئه‌وه‌ی له دۆخی دانه‌پاڵدا شێوه‌ی ناوی کۆ پیشانبده‌ن، گه‌لێك وشه‌و په‌یڤی له‌و جۆره له نووسینه‌که‌دا به‌رچاو ده‌که‌وێت، وه‌ك:

دارێن چیایان

ماسیێت ده‌ریایان

کورێد ڤێ ده‌ڤه‌ری

هه‌ریه‌که‌یان شێوه‌ی کۆی ناوه‌که پیشانده‌ده‌ن له دۆخی دانه‌پاڵدا. ئه‌م نیشانانه تایبه‌تن به زاری کوردی کرمانجی ژووروو.

٧. هه‌ندێ جار بۆ مه‌به‌ستی ئاسانی ده‌ربڕین، که ناوه‌که به نیشانه‌ی (ان) کۆ ده‌کرێته‌وه، پیتی (ن) له قسه‌کردندا ناهێته گۆتن‌و له نووسیندا ناهێته نڤیسین، وه‌ك ئه‌و ڕسته‌ی که له نووسینه‌که‌دا هاتووه( خه‌ڵکی ڤان گوندا مه‌ڕو په‌زو گاگه‌ل به‌خێوده‌که‌ن) که ده‌بووایه (گوندان) بنووسرێت نه‌ك (گوندا).

## دەستور:

١. ناوی کۆ، ناوێکە لە کەسێك یان شتێك پتر پیشاندەدات، نیشانەی سەرەکی کۆکردنەوەی ناو لە زمانی کوردی (ان)ە، کە دەخرێتە دوایی ئەو ناوە تاکانەی کە پیتی کۆتاییان نەبزوێنە.

٢. ئەگەر ناوە تاکەکە کۆتایی هاتبوو بە بزوێنەکانی (ا- ۆ- ێ- ی)، بۆ کۆکردنەوەی بە نیشانەی (ان)، پیتی (ی- y )ی نەبزوێن دەخەینە نێوان ناوەکەو نیشانەکە وەکو ناوبەندێك لەنێوان دوو بزوێندا.

٣. ئەو ناوە تاکانەی کۆتایان بە بزوێنی (وو) هاتووە لەکاتی کۆکردنەوەدا بە نیشانەی (ان)، پیتی نەبزوێنی (و- W ) دەخەینە نێوان ناوەکەو نیشانەکە.

٤. ناوی تاکی کۆتایی هاتوو بە بزوێنی (ە) کە بە نیشانەی (ان) کۆ دەکرێتەوە، بزوێنەکە لادەبەین. بەلام ئەگەر یەك برگە بوو، ناوبەندی (یـ) لە نێوان ناوەکەو نیشانەی کۆ دادەنێین. نموونە

(شە+یـ+ان)

شەیان

٥. جگە لە نیشانەی (ان)، هەندێ نیشانەی دیکە هەن کە ناوی کۆ دروستدەکەن بە تایبەتی لە زاری کوردی کرمانجی خواروو، وەك:(ات، هات، جات، ها)

٦. لە شێوە زاری کرمانجی ژووروودا، لە دۆخی دانەپاڵدا بۆ ناوی کۆ نیشانەکانی (ێن- ێت- ێد) بەکاردێن.

## ڕاهێنانی (١)

ئەم ڕستانە لە تاکەوە بگۆڕە بۆ کۆ:

١. ئەو کەوە باش دەخوێنێت.

٢. تە برایێ من ل بازێڕێ ئامێدیێ دیت.

٣. ددانت جوان بشۆ.

٤. دارڤانی دار بڕی.

٥. بە هاوین قوتابی ناچێتە قوتابخانە.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ناوە تاکانە بکە بە ناوی کۆ:

(هرچ، دەرزی، دۆتمام، پەڕۆ، کەوا، باخ، چاڤ، چرۆ، دێ)

## ڕاهێنانی (٣)

ئـەم ڕسـتانە بخوێنـەوە، پاشـان لـە هـەر ڕسـتەیەکدا نـاوە (کـۆ)یەکـە دەربهێنە تاکەکەشی بەرامبەر بنووسە.

١. کوڕێت گوندان چەلەنگن.

٢. ل شوێنا شێرا، ڕویڤی لێ دکەن گێرا.

٣. میوەجات لە هاویناندا زۆرن.

٤. داوەتا میرا، گڕ لە فەقیرا.

٥. ئەم خوێندکارانە بە یەکەم دەرچوون.

٦. تێرم خواردووە لە کاکڵان، نۆرەی توێکڵانە.

## ڕاهێنانی (٤)

ڕاستی و چەوتی ئەمانەی خوارەوە دیاربکەو چەوتەکان ڕاستبکەوە:

١. لە زمانی کوردی یەك نیشانەی (کۆ)مان هەیە.

٢. ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی(ە) هاتبوو، کە نیشانەی کۆ وەردەگرێت ناوبەندی (ی) دەچێتە نێوان ناوەکەو نیشانەکە.

٣. ناوی تایبەتی کۆناکرێتەوە.

٤. ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی(وو_Û) هاتبوو، کە کۆدەکرێت بزوێنەکە خۆی کورتدەکاتەوە بۆ(و_u) و ناوبەندی(و_ W) وەردەگرێت.

٥. لە شێوەزاری کرمانجی ژووروو، لە هەموو دۆخێکدا بۆ کۆکردن نیشانەکانی (ێن، ێت، ێد) بەکاردێن.

## ڕاهێنانی (٥)

ئەم ناوانە لە دۆخی دانەپاڵدا بەشێوەی کۆ لە ڕستەدا بەکاربهێنە، نیشانەی ( ێن ) بەکاربهێنە:

(چاڤ، دار، ڕووبار، چیا، کچ)

(وانەی پێنجەم)

# ناوی بچووککراو

| ناو | پاشگر | ناوی بچووککراو |
| --- | --- | --- |
| کەپر، بزن | ۆکە | کەپرۆکە، بزنۆکە |
| گۆزە، دیزە | ڵە | گۆزەڵە، دیزەڵە |
| کیژ، چنگ | ۆڵە | کیژۆڵە، چنگۆڵە |
| ئاسك، کرم | ۆڵ | ئاسکۆڵ، کرمۆڵ |
| کار | یلە | کاریلە |
| بەرخ، مێشك | ۆڵە | بەرخۆڵە، مێشکۆڵە |
| مێش، دان | وولە | مێشوولە، دانوولە |
| داس، جام | ولکە | داسولکە، جامولکە |
| باخ، دەریا | چە | باخچە، دەریاچە |
| ڕێ، پێ، گوێ | چکە | ڕێچکە، پێچکە، گوێچکە. |
| منداڵ | ۆچکە | منداڵۆچکە. |
| کوڕ، کچ | ك | کوڕك، کچك |
| گرد | ۆلکە | گردۆلکە |
| گوند، مەنجەڵ | ۆك | گوندۆك، مەنجەڵۆك |
| زەلام، کەنگر، ڕوبار | ۆشك | زەلامۆشك، کەنگرۆشك، ڕووبیارۆشك |
| برا | لە | برالە |
| جام | یلکە | جامیلکە |

## خستنەڕوو:

زۆرجار ناوی گشتی یان تایبەتی، لەکاتی ئاخافتنو نووسیندا، لەشێوەی ناوی بچوککراودا بەکاردەهێنرێن، لەبەر:

١. یان خۆیان ناوی بچوکن.

٢. یان لەبەر نازو خۆشەویستی.

٣. یان بۆ شکاندنیانو کەمکردنەوەی نرخیان.

ئەم ناوانەی کە بمانەوێت لە گەورەکانیان جودایان بکەینەوە، بەهۆی یەکێك لەو پاشگرانەی کە بەکارمان هێناون، بچوکیان دەکەینەوە.

ئەو پاشگرانەی کە ئەم ناوە گشتییانە بچوکدەکەنەوە، بریتین لەم پیتانەی کە لە پەیڤی (چکۆڵە)دا دەبینرێن (چ، ك، ۆ، ڵ، ە).

بۆ بچوککردنەوەی ناوێك، پیتێك یان زیاتری ئەو وشەیە لەگەڵ بزوێنێکدا، کە بگونجێت لەگەڵیدا، بەکاردەهێنین، جار جاریش بزوێنەکان بەپێی پەیڤە تازەکە دەگۆڕین، ئەم بچوککردنەوەش، دەستورو بنەماییێکی تایبەتی لە ناوە تایبەتییەکاندا نییە ، بۆیە پێویست بە باسکردنی ناکات.

هەندێ جار پیتی ( چ ) دەبێتە ( ژ ) وەك لە وشەی (مژە – موژە) کە لە بنەڕەتدا (مووچە)یە، واتە مووی بچوك.

## دەستور:

ناوی بچووککراو، ناوێکە کە بچوکی، وردیی شتێك ڕادەگەنێت وەك: ١- ناوی گشتی بەهۆی ئەم پاشگرانە بچوك دەکرێنەوە (ۆکە، ڵە، ۆڵە، ۆڵ، یلە، ۆلە، ولە، ولکە، چە، چکە، ۆچکە، ك، ۆلکە، ۆشك، لە، یلکە)، مەرجیش نییە هەموو ناوێکی گشتی بچوك بکرێتەوە.

٢- بۆ ناوی تایبەتی هیچ دەستوور و بنەماییێکی جێگیر نییە، کە پێی بچوك بکرێتەوە، ئەم بچوککردنەوەیە بەپێی ناوچەو شێوە زمان دەگۆرێت.

## ڕاهێنانی (١)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

خانوو : (خانووەکە، خانووچکە، خانوولکە)

جام : (جامێك، جامە، جامولکە)

باخ : (باخچە، باخەکە، باخۆك)

ئاسك : (ئاسکێك، ئاسکۆڵ، ئاسکیلە)

کەپر : ( کەپرەك، کەپرۆلە، کەپرۆکە)

قالی : ( قالیچە، قالییەك، قالیلکە)

نازدار : (نازناز، نازێ، ناز)

مەحمود: (حەمە، حەمەد، خولە)

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم پاشگرانە بۆ بچوککردنەوەی ناوی گشتی بەکاردێن، بۆ هەر یەکەیان دوو ناوی گشتی بهێنەو پێیان بچوك بکەرەوە:

(چە، ۆلکە، ۆکە، ۆڵە)

(وانەی شەشەم)

# جێناوی کەسیی لکاو

- ئـ -

١. عەزیزم بۆچی تـۆراوی لە خـۆڕا؟
چ قەوماوە؟ دڵی تۆ بۆچی گۆڕا؟
ئەتۆ وا زوو لەبیرت کردم ئەمما
فەرامۆشت نەکەم شەرتە لە گۆڕا.

٢. دەچێـتە سـەر داریْ لـە ڕۆژی ئیـنـتیـقام و تـۆڵـەدا
ئەو کەسەی کوشتی بە ناهەق پێشەواو سەرداری کورد
نـایـەڵـن ئـادار بەسـەر پـاداری ئـەو دەربـارەوە
چونکە دەیگوت نایەڵم ئاداری کورد، پاداری کورد

٣. قەت واتێـنەگەن چاومان شکـاوە
کوشتــن و بڕیـن دائیـم بۆ پیـاوە
لەناو دۆشەکا کەی هەق سەنراوە؟

٤. بخوێنن چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تیغی دوژمنتان
هەمـوو ئـان و زەمانیْ عەینی قەلغان و سوپەرتـانە

٥. هاتن شەهیدەکان بە جلی سووری خوێنینەوە
دایـکی وەتەن دە هەڵسە سـڵاویـان بسێنەوە

## خستنەڕوو:

ئەگەر سەیری ئەم نمونە هۆنراوانە بکەین، دەبینین، لە هەموویاندا جۆرە جێناوێکمان بەکارهێناوە، کە یەکسەر بە هەندێ لە وشەکانەوە نووساون، ئەو جێناوانە، لەجیاتی جێناوە کەسییە سەربەخۆکان بەکارهاتوون.

لە کۆپلە هۆنراوەی یەکەمدا هەردوو جێناوی (م- ت )ی لکاو بەکارهاتوون، کە یەکەمیان لە شوێنی جێناوی سەربەخۆی (من)ی کەسی یەکەمی تاکو دووەمیشان لەجیاتی جێناوی سەربەخۆی (تۆ)ی کەسی دووەمی تاك بەکارهاتووە، شاعیر، کە دەڵێت (لەبیرت کردم) مەبەستی ئەوەیە بڵێت ( تۆ منت لەبیرکرد ) واتە جێناوی لکاوی (ت) شوێنی (تۆ)ی گرتووە، هەروەها جێناوی لکاوی (م) شوێنی (من)ی گرتووەتەوە، کە هەردووکیان لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕی (لەبیرت کردم)دا بەکارهاتوون.

٢. لە کۆپلە هۆنراوەی دووەمدا جێناوی لکاوی (ی) کە بەهەردوو کاری ڕابردووی تێپەڕی (کوشتی- دەیگوت)ەوە لکاوە، جێی ئەو کەسە دەگرێتەوە کە لەباری یەکەمدا کوشتنەکەی جێبەجێکردووەو لە باری دووەمیشدا گوتنەکەی ئەنجامداوە. ئەو کەسەی ئامادەنییە پێیدەگوترێت کەسی سێیەمی تاك.

لە جێناوە کەسییە سەربەخۆکانیش بە (ئەو) دهێتە دەستنیشانکردن.

٣. لـه كۆپلـەی سـێیەمدا جێنـاوی لكـاوی (مـان) لـه جیـاتی (ئێمـه) بـەكارهاتووەو خراوەتـە سـەر نـاوی (چـاو) و بـووە بـە (چـاومان) كـە مەبەست چاوی ئێمەیە، واتا (مان) كە هەر خۆی شـێوەی كـۆی جێنـاوی لكاوی (م)ی كەسی یەكەمی تاكە، بۆ كەسی یەكەمی كۆ بەكارهاتووە.

٤. لـه دێـره هـۆنراوەی ژمـاره (٤)، دووجـار جێنـاوی لكـاوی (تـان) بـەكارهاتووه، لـە هـەردوو جاریشـدا بەناوێكـەوه لكـاوه، (دوژمنتـان، سوپەرتانه)، ئەم جێناوه دەگەرێتەوه بۆ كەسی دووەمـی كـۆو لـه جێـی (ئێوه) بەكارهاتووه، دیاره ئەمەشیان كۆی جێناوی لكاوی (ت)ی كەسی دووەمی تاكه.

٥. هەروەها له دێره هۆنراوەی دواییشدا جێناوی (یان) خراوەته سەر ناوی (سلاو)و بووه به (سلاویان) كه مەبەست پێی سـلاوی ئەوانـه، واتـه لـەجیاتی جێنـاوی كەسـی سـەربەخۆی (ئـەوان) بـەكارمان هێنـاوه، كـە كەسی سێیەمی كۆیە.

## دەستور:

**جێنـاوه لكاوەكـان ئەوانـەن، كـه لـه جیـاتی نـاوی كەسـێك یـان شـتێك بەكاردێن و هەمیشـه بـه وشـه دەلكێن، ئـەو جێناوانـەش بـه تـەنیا هـیچ مەبەستێك بەدەستەوه نادەن، بەلام كه لكان ئـەوا مەبەسـت دەپـێكن، لـه رووی بەكارهێنانەوەش دەكرێن به سێ كۆمەڵە(١،٢،٣):**

**جێناوه كەسییه لكاوەكانی كۆمەڵەی(یەكەم): ئەوانه بوون باسمـانكردن و بەكورتی بریتین له:**

١. م جێی (من)ی کەسی یەکەمی تاك دەگرێتەوە.
٢. مان جێی (ئێمە)ی کەسی یەکەمی کۆ دەگرێتەوە.
٣. ت جێی (تۆ)ی کەسی دووەمی تاك دەگرێتەوە.
٤. تان جێی (ئێوە)ی کەسی دووەمی کۆ دەگرێتەوە.
٥. ی جێی (ئەو)ی کەسی سێیەمی تاك دەگرێتەوە.
٦. یان جێی (ئەوان)ی کەسی سێیەمی کۆ دەگرێتەوە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| تۆراوی | : | زیزبووی، سل بووی |
| لە خۆڕا | : | بەبێ هیچ هۆیەك |
| فەرامۆشت نەکەم | : | لەبیرت نەکەم، تە ژبیر نەکەم |
| ئادارو پادار | : | دارو پەردوو، کەرەستەی بیناسازی |
| دەربار | : | کۆشكو بالاخانەی پاشا |

## جێناوی کەسی لکاو

- ب -

**ژمارەیەك هەڤاڵ و دۆست چووین بۆ ڕاوەماسی، من یەکەم جارم بوو دەچووم بۆ ئەو جۆرە ڕاوە، هەڤاڵێکم پێی گوتم: تۆ مەلە دەزانیت؟ ئەو کەسەی مەلەکردن دەزانێت لەو جۆرە ڕاوەدا پەکی ناکەوێت، کە ماسی دەگرن، ئاگاداری خۆتان بن، چونکە ڕوبار ئاوی زۆرە. جارێکیان لەگەڵ دەستەیەك برادەرو هەڤاڵ لە ڕاوەماسیدا بەشداریمکرد، ئەوان هەموو ساڵێك دەهاتن بۆ ئەو شوێنەی ئێستا ئێوە بۆی دەچن، هەمووشیان مەلەوانی چاك بوون بەتایبەتی ئاراسی هەڤاڵم کە باسکەمەلەی چاك دەکات، ئەو لەگەڵ هەڤاڵانی چوو بۆ ڕاوەکە، هیوام وایە ئێوەش لەو ڕاوەدا سەرکەوتووبن.**

### خستنەڕوو:

لە خوێندنەوەی ئەم نووسینەدا، ئەوە تێدەگەین کە قسەکەر نەك بەتەنیا، بەڵکو لەگەڵ کۆمەڵێك هەڤاڵ و دۆست ڕاوە ماسییان دەکرد، کە جۆرە وەرزشێکی سود بەخشەو پێویستە بەپێی توانا بایەخی پێبدرێت و شێوازی ئەنجامدانی ڕێکبخرێت، لە ڕستەکاندا ژمارەیەك جێناو هەن، کە لەگەڵ ژمارەیەك کاری جۆراو جۆر بەکارهاتوون:

١. له ڕستەی (ژمارەیەك هەڤاڵو دۆست چووین بۆ ڕاوەماسی) جێناوی لکاوی (ین) لەگەڵ کاری (چوو)ی ڕابردووی تێنەپەڕ بەکارهاتووەو جێی (ئێمە)ی کەسی یەکەمی کۆی گرتووەتەوە.

٢. له ڕستەی (من یەکەم جارم بوو دەچووم بۆ ڕاوەماسی)، جێناوی کەسیی لکاوی (م) بۆ کەسی یەکەمی تاك بەکارهاتووەو خراوەتە سەر کاری ڕابردووی تێنەپەڕی (چوو).

٣. بەڵام ئەگەر سەرنجی ڕستەی پرسیاری، تۆ مەله دەزانیت؟ بدەین، دەبینین، جێناوی کەسی لکاوی (یت) لەگەڵ کاری ڕانەبردووی تێپەڕی (دەزانیت) بەکارهاتووەو جێی کەسی دووەمی تاکی گرتووە.

٤. هەروا له ڕستەی (ئەو کەسەی مەلەکردن دەزانێت لەو جۆرە ڕاوەدا پەکی ناکەوێت) دەبینین جێناوی کەسی (ێت) خراوەتە سەر هەردووکاری ڕانەبردووی تێپەڕی (دەزانێت)و (پەکی ناکەوێت)و جێی کەسی سێیەمی تاکی گرتووە.

٥. ئینجا له سەرنجدانی ڕستەی (ئەوان هەموو ساڵێك دەهاتن بۆ ئەو شوێنەی ئێستا ئێوە بۆی دەچن).

دەبینین دووجار لەگەڵ دووکاردا جێناوی کەسی لکاوی (ن) بەکارهاتووە، جارێك لەگەڵ کاری ڕابردووی تێنەپەڕی (دەهاتن) جارێکیش لەگەڵ کاری ڕانەبردووی تێنەپەڕی (دەچن). له جاری یەکەمدا (ن) لەگەڵ کاری (دەهاتن) وەکو جێناوێکی لکاو جێی کەسی سێیەمی کۆ دەگرێتەوە، که (ئەوان)نو له جاری دووەمیشدا

لەگەڵ کاری (دەچن) هەر ئەو جێناوە لکاوە شوێنی کەسی دووەمی کۆ دەگرێتەوە کە (ئێوە)ن.

٦. هەر بەم شێوەیە ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەی (هەمووشیان مەلەوانی چاك بوون، بەتایبەتی ئاراسی هەڤاڵم، کە باسکەمەلەی چاك دەکات، ئەو لەگەڵ هەڤالانی چوو بۆ ڕاوەکە).

دەبینین لەگەڵ کاری ڕانەبردووی تێپەڕی (دەکات)دا جێناوی کەسی لکاوی (ات) بەکارهاتووە کە جێی کەسی سێیەمی تاك دەگرێتەوە، واتە لێرەدا ئاماژە بەوە دەکەین کە هەندێ کاری ڕانەبردووی تێپەڕ، ئەوانەی لەو بەشەیان دا، کە دەکەوێتە پێش جێناوە لکاوەکان کۆتاییان بە بزوێنی، (ە، ۆ) دێت لەگەڵ کەسی سێیەمی تاك جێناوی لکاوی (ات) وەردەگرن، وەك: (دەخوات، دەکات، دەڕوات، دەبات)

کەچی دەبینین لە کاری (چوو) کە ڕابردووی تێنەپەڕە لەگەڵ کەسی سێیەمی تاکدا جێناوی لکاو دەرناکەوێت.

| جیّناوی کەسی سەربەخۆ | کۆمەڵەی یەکەم | کۆمەڵەی دووەم | کۆمەڵەی سێیەم |
|---|---|---|---|
| **من** | م | م | م |
| **ئێمە** | مان | ین | ین |
| **تـۆ** | ت | یت | یت |
| **ئێوە** | تان | ن | ن |
| **ئەو** | ی | Ø | (ێت – ات)[1] |
| **ئەوان** | یان | ن | ن |

## دەستور:

**کۆمەڵەی (دووەم) لە جێناوە لکاوەکان وەك کۆمەڵەی (یەکەم) چالاك نین، بەڵام بەشێکی گرنگی ڕستە پێکدەهێنن. ئەم کۆمەڵە بریتییە لە:**

**١. م : بۆ کەسی یەکەمی تاك.**

**٢. ین : بۆ کەسی یەکەمی کۆ.**

**٣. یت: بۆ کەسی دووەمی تاك.**

**٤. ن : بۆ کەسی دووەمی کۆ.**

**٥. (Ø): بۆ کەسی سێیەمی تاکە.**

**٦. ن : بۆ کەسی سێیەمی کۆ.**

[1] – ئەگەر ڕەگی کار کۆتایی بەبزوێنی (ۆ–ە) هات ئەوە (ات) وەردەگرێت، ئەگینا (ێت) وەردەگرێت.

کۆمەڵەی(سێیەم) لە جێناوە لکاوەکان، لەگەڵ کاری ڕانەبردووی تێپەڕو تێنەپەڕ بەکاردێت، کە ئەم جێناوانە دەگرێتەوە:

١. م : بۆ کەسی یەکەمی تاك.
٢. ین : بۆ کەسی یەکەمی کۆ.
٣. یت: بۆ کەسی دووەمی تاك.
٤. ن : بۆ کەسی دووەمی کۆ.
٥. (ات – ێت): بۆ کەسی سێیەمی تاك.
٦. ن : بۆ کەسی سێیەمی کۆ.

## جێناوی کەسیی لکاو

- پ -

(ئـ)

١. ئەز شەڤێ دی ل سەربانی نڤستم.

٢. ئەم هاڤینێ ل سەربانا دنڤین.

٣. تو ڕێزمانا کوردی دخوینی.

٤. هوین ڕابوون و کەلا زۆرداریێ هەرفاند.

٥. ئەو گەلەك نامان بۆ هەڤاڵێن خۆ دنڤیسی(دنڤیسیە).

٦. ئەو دوهی هاتنە ڤێرێ.

(ب)

١. تە ئەز دیتم

٢. من تو دیتی.

٣. ئەوی ئەو دیت.

٤. تە ئەم دیتین.

٥. من هوین دیتن.

٦. ئەوی ئەو دیتن.

## خستنەڕوو:

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکان دەبینین، لە کۆمەڵە ڕستەی (ئـ)دا ئـەو جێنـاوە کەسـییە سـەربەخۆیانەی کـە بـەکارهاتوون، وەك: (ئـەز، ئەم... هتد) هـەموویان ئـەرکی (بکـەر)دەبیـنن و هەریەکـەیان جێنـاوێکی کەسیی لکاوی لەگەڵدا بەکارهاتووە، کـە بەکارەکـەوە نووسـاوەو هـەمان ئەرك دەبینێت.

ئـەوەتا لـە ڕسـتەی یەکەمـدا جێنـاوی کەسـیی لکـاوی (م) بـەکاری ڕابردووی تێنەپەڕی (نڤست)ەوە نووسـاوەو شـوێنی (ئـەز)ی بکـەری لـە ڕستەدا گرتووە، کە کەسی یەکەمی تاکە.

لە ڕستەی دووەمیشدا جێناوی (ین) بـەکاری ڕانـەبردووی تێنەپـەڕی (دنڤین)ەوە نووساوەو شوێنی (ئـەم)ی بکـەری گرتـووە، کـە بۆ کەسـی یەکەمی کۆیە.

لە ڕستەی سێیەمدا جێناوی کەسیی لکاوی (ی) بـەکاری ڕانـەبردووی تێپەڕی (دخوینی)یەوە نووساوەو جێی (تۆ)ی بکەری گرتووە، بۆ کەسی دووەمی تاك.

لە ڕستەی چوارەمدا جێناوی کەسیی لکاوی (ن) خراوەتە سەر کـاری ڕابردووی تێنەپەڕی (ڕابوو)، جێی (هوین)ی جێناوی کەسیی سەربەخۆی گرتۆتەوە کە بۆ کەسی دووەمی کۆیە.

لە ڕستەی پێنجەمدا جێنـاوی (ی) خراوەتـە سـەر کـاری ڕانـەبردووی تێپەڕی (دنڤیسی)و شوێنی (ئەو)ی کەسی سێیەمی تاك دەگرێتەوە، کـە

بکەرە لە هەندێ باریشدا لە جیاتی(ی) جێناوی (ە) وەردەگرێتو بە کارەکەوە دەلکێت، وەکو لە ڕستەکەدا دیارەو نووسراوە (دنقیسە).

لە ڕستەی شەشەمدا جێناوی کەسیی لکاوی (ن) لەگەڵ کاری ڕابردووی تێنەپەڕی (هات) بەکارهاتووەو لە ئەرکی (بکەر) دایەو جێی کەسی سێیەمی کۆ دەگرێتەوە.

لە کۆمەڵە ڕستەی (ب) دوو کۆمەڵە جێناوی کەسیی سەربەخۆ بەکارهاتووە. جێناوەکانی کۆمەڵەی یەکەمیان لە ئەرکی (بکەر) دانو ئەوانەی کۆمەڵەی دووەم خۆیانو جێناوە کەسییە لکاوەکانی سەر بەوان لە ئەرکی (بەرکاردان)و ئەو جێناوە لکاوانەش هەر ئەوانەی پێشووترن.

لە ڕستەی (تە ئەز دیتم)دا، جێناوی کەسیی سەربەخۆی (تە) لە ئەرکی (بکەر) دایەو جێناوی کەسیی سەربەخۆی (ئەز) لە ئەرکی بەرکاردایەو جێناوە کەسییە (لکاو)ەکە بەکاری (دیت)ی ڕابردووی تێپەڕەوە نووساوەو ئەویش لە ئەرکی (بەرکار)دایە.

هەر بە هەمان شێوە لە ڕستەکانی تریش یەک لەدوای یەک جێناوە کەسییە لکاوەکانی (ی، ین، ن، ن) لە ئەرکی (بەرکار)دا بەکارهاتوون.

## دەستور:

**ئەو جێناوە کەسییە لکاوانەی کە لەشێوە زاری کرمانجی ژووروودا بەکاردێن، هەر ئەوانەن کە کۆمەڵەی دووەمی جێناوە کەسییە لکاوەکانی شێوە زاری کوردی کرمانجی خواروو بەکاریان دەهێنێت، لەگەڵ کەمێک**

**جیاوازی لەشێوەی هەندێکیان، لەم شێوە زارەدا بە زۆری جێناوە کەسییە سەربەخۆکان لە ڕستەدا ناودەبرێن.**

**ئەو جێناوە کەسییە لکاوانەش لە (دوو ئەرك)دا بەکاردێن:**

1. **لەگەڵ کاری ڕابردووی تێنەپەڕو ڕانەبردووی تێپەڕو تێنەپەڕ کە ئەرکی (بکەر) دەبینن، وەك نمونەکانی بەشی(ئـ).**
2. **لەگـەڵ کـاری ڕابـردووی تێپـەڕ لـەم بارەشـدا ئـەرکی (بـەرکار) دەبینن، وەکو نمونەکانی بەشی (ب).**

| ژمارە | کەس | جێناوی لکاو |
|---|---|---|
| تـاك | یەکەم | م |
| | دووەم | ی |
| | سێیەم | ی، ە |
| کـۆ | یەکەم | ن (ین) |
| | دووەم | ن |
| | سێیەم | ن |

## ڕاهێنانی (١)

ئەم کارانە لەگەڵ جێناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی (پ) بەکاربێنە:

(هات، گرت)

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم جێناوە کەسییە سەربەخۆیانە بە جێناوی کەسیی لکاو بگۆڕە، وەك نمونەی (ب):

ئـ- تۆ (هاتن) بۆ قوتابخانە.

ب- هاتیت بۆ قوتابخانە.

١. من (چوون) بۆ دهۆك.

٢. ئێمە (خواردن) خوارد.

٣. ئێوە هەموو ڕۆژێك (جل شتن).

٤. تۆ چیرۆکەکە (خوێندنەوە).

٥. ئەوان هەمیشە بە ڕۆژ (نووستن).

## ڕاهێنانی (٣)

وەلامی ڕاست هەلبژێرە:

(تان)جێناوی لکاوە بۆ کەسی:(یەکەمی تاك، دووەمی کۆ، سێیەمی تاك)

(یت)جێناوی لکاوە بۆ کەسی:(دووەمی کۆ، سێیەمی تاك، دووەمی تاك)

(ین)جێناوی لکاوە بۆ کەسی:(یەکەمی کۆ، دووەمی کۆ، سێیەمی کۆ)

(یان)جێناوی لکاوە بۆ کەسی:(دووەمی کۆ، یەکەمی کۆ، سێیەمی کۆ)

(ن)جێناوی لکاوە بۆ کەسی:(دووەمی تاك، یەکەمی کۆ، سێیەمی کۆ)

(ێت)جێناوی لکاوە بۆ کەسی:(دووەمی تاك، سێیەمی تاك، سێیەمی کۆ)

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستەیەی خوارەوە بگۆڕە، لەگەڵ گۆڕینی جێناوە کەسییە لکاوەکان بۆ:

١. کەسی یەکەمی کۆ.

٢. کەسی دووەمی تاك.

٣. کەسی سێیەمی کۆ.

٤. کەسی دووەمی کۆ.

( من زۆر بەخێرایی باری ژیانم دەگۆڕم )

## ڕاهێنانی (٥)

ئەم ڕستانە بۆ ئەو جێناوانەی بەرامبەریان بگۆڕە:

١.ئەو دەیەوێت کوردستان لە ڕووی پیشەسازییەوە پێش بخات. (ئێمە)

٢.تۆ گەلێك شتی سەیرو بە کەڵکت داهێناوە. (ئێوە)

٣.زۆرم پێخۆشە بێیت بۆ لام. (ئەوان)

٤.دوێنێ چاوم بە هاوڕێکەم کەوت. (تۆ)

## ڕاهێنانی (٦)

ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

١. ئەوان سێو دەخۆن.

٢. من دەستێ وی گرت.

٣. تە ئەز بردم.

( وانەی حەوتەم )

# هاوەڵـناو

١. کۆتری **سپی** نیشانەی ئاشتییە.

٢. کوردستان بە ئێوەی **تێکۆشەر** سەردەکەوێت.

٣. سەیرانەکەمان **خۆش** بوو.

٤. ئەسپی **چاك** ئاوزەنگی ناوێت.

## خستنەڕوو:

ئەگەر سەیری ڕستەکان بکەین دەبینین:

١. لە ڕستەی یەکەمدا وشەی (سپی) وەسفی ناوی (کۆتر)ی کردووە بەهۆی ئامرازی دانەپاڵی (ی)یەوە بووەتە دیارخەری ناوەکە، بۆی ڕوونکردووینەوە، کە (کۆترێك)ی چۆنمان مەبەستە، لەبەر ئەوە بە وشەی (سپی) دەوترێت (هاوەڵناو).

٢. لە ڕستەی دووەمدا وشەی (تێکۆشەر) وەسفی جێناوی (ئێوە)ی کردووە بەهۆی ئامرازی دانەپاڵی (ی) بووەتە دیارخەری جێناوەکە، بۆی ڕوونکردووینەوە، کە بە (کێ) کوردستان سەردەکەوێت، لەبەر ئەوە بە وشەی (تێکۆشەر) دەوترێت (هاوەڵناو).

٣. لە ڕستەی سێیەمدا وشەی (خۆش) واتای کاری ناتەواوی (بوو)ی تەواوکردووە، بووە بە تەواوکەری کارە ناتەواوەکە بەبێ

یاریـدەری ئـامرازی دانـەپاڵ، لەبـەر ئـەوە بـە وشـەی (خـۆش) دەوترێت (هاوەڵناو).

٤. لە ڕستەی چوارەمدا بە هەمان شێوەی ڕستەی یەکەم وشەی (چاك) وەسفی ناوی (ئەسپ)ی کردووە، بووە بە دیارخەری ناوەکە، بە یاریدەی ئامرازی دانەپاڵی (ی)یەوە بۆی ڕوونکردووینەوە کە چ ئەسپێك ئاوزەنگی ناوێت، لەبەر ئەوە بە وشەی (چاك) دەوترێت (هاوەڵناو).

## دەستور:

**هاوەڵناو وشەیەکە وەسفی ناوێك یان جێناوێك دەکاتو دەبێتە دیارخەری ناوەکە یان جێناوەکە هەروەها هاوەڵناو دەبێتە تەواوکەری کاری ناتەواویش.**

(وانەی هەشتەم)

# هاوەڵناوی چۆنییەتی

١. مرۆڤی باش سەردەکەوێت.

٢. ترێی ڕەش بکرە.

٣. ماسیی گەورە لە ڕووبارەکەدا هەیە.

٤. شیرین نازدارە.

٥. خانووەکە کۆن بوو.

٦. مرۆڤی نیشتمانپەروەر سەرفراز دەبێت.

٧. ئێوەی زیرەك بە ئامانج دەگەن.

٨. گۆتنا خۆش بهارا دلانە.

٩. باشترین چیرۆکم خوێندەوە.

## خستنەڕوو:

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکان، دەبینین ئەو وشانەی هێلیان بە ژێردا کێشراوە، وەك {باش، ڕەش، گەورە، نازدار، کۆن، نیشتمانپەروەر، سەرفراز، زیرەك، خۆش} هەموویان هاوەڵناوی چۆنین، چونکە هەر یەکەیان وەسفی ناوێك یا جێناوێکی کردووە، واتە بووە بە دیارخەری ناوەکە یان جێناوەکە، یاخود بووەتە تەواوکەری کاری ناتەواو، وەکو:

١. لە ڕستەی یەکەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی (باش) وەسفی ناوی (مرۆڤ)ی کردووەو بووەتە دیارخەری ناوی (مرۆڤ).

٢. لە ڕستەی دووەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی (ڕەش) وەسفی ناوی (ترێ)ی کردووەو بووەتە دیارخەری ناوی ترێ.

٣. لە ڕستەی سێیەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی (گەورە) وەسفی ناوی (ماسی)ی کردووەو بووەتە دیارخەری ناوی (ماسی).

٤. لە ڕستەی چوارەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی (نازدار) بووەتە تەواوکەری کاری ناتەواو.

٥. لە ڕستەی پێنجەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی (کۆن) بووەتە تەواوکەری کاری ناتەواوی (بوو).

٦. لە ڕستەی شەشەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی (نیشتمانپەروەر) وەسفی ناوی (مرۆڤ)ی کردووەو بووەتە دیارخەری ناوەکە. هەروەها هاوەڵناوی چۆنییەتی (سەرفراز) بووەتە تەواوکەری کاری ناتەواوی (دەبێت).

٧. لە ڕستەی حەوتەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی (زیرەك) وەسفی جێناوی (ئێوە)ی کردووەو بووەتە دیارخەری جێناوی (ئێوە).

٨. لە ڕستەی هەشتەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی (خۆش) وەسفی چاوگی[1] (گۆتن)ی کردووەو بووەتە دیارخەری چاوگەکە.

٩. لە ڕستەی نۆیەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی (باشترین) وەسفی جێناوی (چیرۆکی)ی کردووەو بووەتە دیارخەری.

---

[1] – هەموو چاوگێك ناوی واتاییە، لەڕستەدا ئەركی ناو دەبینێت.

## دەستور:

**هاوەڵناوی چۆنییەتی:** ئەو هاوەڵناوەیە کە لە ڕستەدا وەسفی ناوێك یا جێناوێك دەکاتو دەبێتە دیارخەری ناوەکە یا جێناوەکە، یاخود دەبێتە تەواوکەری کاری ناتەواو.

ئەگەر ببێتە دیارخەری ناو بە دوو شێوە دەبێت:

١. لە شێوە زاری کرمانجی خواروو (ی-ە) بەکاردەهێنرێ.

٢. لە شێوە زاری کرمانجی ژووروو بەم شێوەیە:

ئـ- ئەگەر ناوەکە نێری تاك بوو (ێ) بەکار دەهێنرێ.

ب- ئەگەر ناوکە مێی تاك بوو (ا) بەکار دەهێنرێ.

پ- ئەگەر ناوەکە کۆ بوو نێر یا مێ {ێت- ێد- ێن} بەکاردەهێنرێ.

ئامرازی دانە پال دەخرێتە نێوانیان ئەگەر هاوەڵناوی چۆنییەتی لە دوای ناوەکە یا جێناوەکە بێت. بەڵام ئەگەر هاوەڵناوی چۆنییەتی کەوتە پێش ناوەکە ئامرازی دانە پاڵی پێویست نییە.

هاوەڵناو ئەگەر بکەوێتە پێش ناو پێویستی بە ئامرازی پەیوەندی نییە.

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا هەر هاوەڵناوێکی چۆنییەتی هەیە دەریبهێنەو ئەرکەکەی دیاربکە.

١. پێ لە تەختەی چروک مەنێ.

٢. مە چاڤێن بەلەك دیتن.

٣. هەنار میوەیەکێ خۆشە.

٤. یارمەتیی مرۆڤی هەژار بدەن.

٥. پرچا بەفرینێ زەرە.

٦. ڕێزی مرۆڤی مەزن بگرن.

٧. شێرکۆ کوڕەکی ئازایە.

٨. چیایێن کوردستانێ بلندن.

٩. ئێوەی تێکۆشەر سەردەکەون.

## ڕاهێنانی (٢)

شەش ڕستە بهێنەرەوە، کە هاوەڵناوی چۆنییەتی تێدا بێت.

سێیانیان دیارخەری ناو بن، دووانیان دیارخەری جێناو بن، یەکێکیان تەواوکەری کاری ناتەواو بێت.

## ڕاهێنانی (٣)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. دارستانێکی چڕ لە نزیك دێیەکەمان هەیە. (هاوەڵناوی چۆنی، ناو، جێناو)

٢. جوان پیشانگاکەی ڕازاندەوە.(جێناوە، هاوەڵناوی چۆنییە، ناوە)

٣. ماسی گەورە لە تاقگەدا ناگیرێ.(ناوە، هاوەڵناوی چۆنییە، جێناوە)

٤. ئێوە هیوای دواڕۆژن. ( هاوەڵناوی چۆنییە، ناوە، جێناوە)

٥. ڕاگرتنی پاکوخاوێنیی شار ئەرکێکی نیشتمانییە. (ناوە، هاوەڵناوی چۆنییە، جێناوە)

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شلۆڤەبکە:

١. دراوی سپی بۆ ڕۆژی ڕەشە.

٢. سێوی باش بکڕە.

٣. دەستمالا نەسرینێ جوانە.

(وانەی نۆیەم)

# جۆرەکانی هاوەڵناوی چۆنییەتی

## (لەڕووی دروستکردنییەوە)

ئـ/

١. گوڵی جوان بچێنە.

٢. ئاوی کانی پاکە.

٣. تۆی زیرەك دەردەچیت.

٤. چەند چیا بلند بن نهال[1] کویر[2] دبن.

٥. درەختی سەوز جوانە.

ب/

١. بهارا کوردستانێ گەلەکا ڕەنگینە.

٢. کتێبی بەسوود بخوێنەوە.

٣. مرۆڤێ دەشتەکی بەهێزە.

٤. مرۆڤێ بێ ورە سەرناکەوێت.

٥. گەلێن هشیار پێش دکەڤن.

٦. منداڵی نابینا هەستیارە.

پ/

١. یارمەتیی مرۆڤی دڵسووتاو بدەن.

٢. لە مرۆڤێ زارخۆشی زگرەش دویر کەڤە.

٣. گولیزار کچەکا ڕووخۆشە.

٤. موحەمەد عارفێ سترانبێژ هونەرمەندەکێ مەزن بوو.

٥. پیاوی دەستبڕ لەناو دەچێت.

---

[1] نهال : دۆڵ

[2] کویر : قوڵ

## خستنەڕوو:

ئـ- کاتێ سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) دەکەین، دەبینین پەیڤەکانی (جوان، پاك، زیرەك). هەموویان هاوەڵناوی چۆنیەتین‌و بوونەتە دیارخەری ناوێك یا جێناوێك یاخود تەواوکەری کاری ناتەواو. بەڵام ئەگەر لە ڕووی دروست بوونیانەوە سەیریان بکەین، دەبینین کە هەر یەکەیان تەنها لە یەك وشەی واتادار پێکهاتووە، لەبەر ئەمە پێیان دەگوترێ هاوەڵناوی سادە.

ب- ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (ب) دەبینین وشەکانی (ڕەنگین، بەسوود، دەشتەکی، بێ ورە، هشیار (هوشیار)، نابینا، هەستیار). هەموویان هاوەڵناوی چۆنیەتین‌و بوونەتە دیارخەری ناوێك یا تەواوکەری کاری ناتەواو. بەڵام لە ڕووی دروست بوونیانەوە هەر یەکەیان لە وشەیەکی واتادار لەگەڵ پێشگرێك یا لەگەڵ پاشگرێك پێکهاتووە، لەبەر ئەمە پێیان دەگوترێ هاوەڵناوی داڕێژراو. وەکو:

١. لە ڕستەی یەکەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی داڕێژراو (ڕەنگین) لە وشەی ڕەنگ لەگەڵ پاشگری (ین) پێکهاتووە.
٢. لە ڕستەی دووەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی داڕێژراو (بەسوود) لە پێشگری (بە) وشەی (سوود) پێکهاتووە.
٣. لە ڕستەی سێیەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی داڕێژراو (دەشتەکی) لە وشەی (دەشت)و پاشگری (ەکی) پێکهاتووە. هەروەها

هاوەڵناوی چۆنییەتی داڕێژراو (بەهێز) لە پێشگری (بە) لەگەڵ وشەی (هێز) پێکهاتووە.

٤. لە ڕستەی چوارەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی داڕێژراو (بێ ورە) لە پێشگری (بێ) لەگەڵ وشەی (ورە) پێکهاتووە.

٥. لە ڕستەی پێنجەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی داڕێژراو (هشیار، هوشیار) لە وشەی (هش) (هۆش) لەگەڵ پاشگری (یار) پێکهاتوون.

پ- دیسان ئەگەر سەیری ڕستەکانی (پ) بکەین، دەبینین وشەکانی (دڵسووتاو، زارخۆش، زگڕەش، ڕووخۆش، سترانبێژ، دەستبڕ) هەموویان هاوەڵناوی چۆنیەتیین، بەڵام لە ڕووی دروست بوونیانەوە هەریەکەیان لە دوو وشەی واتادار یا پتر پێکهاتووە، لەبەر ئەمە پێیان دەگوترێ هاوەڵناوی لێکدراو. وەکو:

١. لە ڕستەی یەکەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی لێکدراو (دڵسووتاو) لە دوو وشەی واتادار (دڵ+سووتا) لەگەڵ پاشگری (و) پێکهاتووە.

٢. لە ڕستەی دووەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی لێکدراو (زارخۆش) لە دوو وشەی واتادار (زار+خۆش) پێکهاتووە. هەروەها هاوەڵناوی چۆنییەتیی لێکدراو (زگڕەش) لە دوو وشەی واتادار (زگ+ ڕەش) پێکهاتووە.

٣. لە ڕستەی سێیەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی لێکدراو (ڕووخۆش) لە دوو وشەی واتادار (ڕوو+خۆش) پێکهاتووە.

٤. لە ڕستەی چوارەمدا هاوەڵناوی چۆنییەتی لێکدراو (سترانبێژ) لە دووشەی واتادار (ستران+ بێژ) پێکهاتووە.

٥. له ڕسته‌ی پێنجه‌مدا هاوه‌ڵناوی چۆنییه‌تی لێكدراو (ده‌ستبڕ) له دوو وشه‌ی واتادار (ده‌ست+بڕ) پێكهاتووه.

## ده‌ستور:

**هاوه‌ڵناوی چۆنییه‌تی له ڕووی دروستكردنییه‌وه ده‌كرێت به دوو جۆر:**

**١- هاوه‌ڵناوی ساده: وشه‌یه‌كی واتاداری سه‌ربه‌خۆیه.**

**٢- هاوه‌ڵناوی ناساده:**

**ئـ- له وشه‌یه‌كی واتادار له‌گه‌ڵ پاشگرێك یان پێشگرێك یان هه‌ردووكیان پێكهاتووه.**

**ب- هاوڵناوی لێكدراو: له دوو وشه‌ی واتادار یا پتر پێكهاتووه.**

## ڕاهێنانی (١)

له‌م ڕستانه‌ی خواره‌وه‌دا هاوه‌ڵناوی چۆنییه‌تی ده‌ربهێنه‌و جۆره‌كه‌ی دیاربخه:

١. باخێ مه یێ جوانه.

٢. مرۆڤی ده‌ستكورت هه‌یه.

٣. ئاوی كانی سازگاره.

٤. گوڵناز كچه‌كا به‌ژن زراڤه.

٥. كاری نارێك سه‌رناگرێت.

٦. گوندێ وان یێ دویره.

## ڕاهێنانی (٢)

جیاوازی لەنێوان هاوەڵناوی داڕێژراو و لێکدراودا چییە؟ بە نمونە ڕوونی بکەرەوە.

## ڕاهێنانی (٣)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

فرۆکەوان : (سادەیە، داڕێژراوە، لێکدراوە)

خوێندەوار : (لێکدراوە، سادەیە، داڕێژراوە)

دوودڵ : (داڕێژراوە، لێکدراوە، سادەیە)

نەمر : (داڕێژراوە، سادەیە، لێکدراوە)

سوێر : (لێکدراوە، سادەیە، داڕێژراوە)

چین چین: (سادەیە، داڕێژراوە، لێکدراوە)

ورد : (داڕێژراوە، لێکدراوە، سادەیە)

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

١. گەلی ژێردەست تێدەکۆشێت.

٢. مە زنجیرا ستویر پساند.

٣. کۆمپیوتەر ئامێرێکی بەسوودە.

(وانەی دەیەم)

# پلەکانی هاوەڵناوی چۆنییەتی

ئ/

١. ئاروی ناسك بکرە.

٢. گولێن مە گەش بوون.

٣. ئێوەی تێگەیشتوو سەردەکەون.

٤. ئاڤا شیرین ڤەخۆ.

ب

١. ئازاد لە نەوزاد ژیرترە.

٢. ئەڤ گوڵە ژ گولا دی سۆرترە.

٣. کتێبا من ژ کتێبا تە کەڤنتربوو.

پ/

١. هەڵگود بڵندترین چیایە لە کوردستانی باشووردا.

٢. بەختیار قوتابیی هەرە زیرەکی ئەم قوتابخانەیە.

٣. دلۆڤان ژ هەمیا مەزنترە.

٤. ئازاد لە گشت خوێندکاران باشترە.

٥. نەرمین لە هەموو خوێندکاران هێمنترە.

## خستنەڕوو:

ئـ- کاتێ سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) دەکەین، دەبینین وشەکانی هێڵیان بەژێرەوەیە {ناسك، گەش، تێگەیشتوو، شیرین} هەموویان هاوەڵناوی چۆنیەتین‌و هەر یەکەیان بۆ وەسفی ناوێك یان جێناوێك، یاخود بۆ تەواوکردنی کاری ناتەواو بەکارهێنراون، لێرەدا هاوەڵناوەکە لە پلەی چەسپاودایە.

ب- ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (ب) دەبینین وشەکانی هێلیان بەژێرەوەیە (ژیرتر، سۆرتر، کەڤنتر). هەموویان هاوەڵناوی چۆنییەتین‌و لە پلەی بەراورددان، چونکە هەریەکەیان بۆ بەراوردکردن لەنێوان دوو ناوی وەسفکراو بەکارهێنراون، کە هەردووکیان لە سیفەتەکە هاوبەشن، بەڵام پلەی یەکێکیان پترە لەوی تر. بە دانانی نیشانەی (تر) لە کۆتایی هاوەڵناوی چۆنییەتی دروستدەکرێت‌و ئامرازی پەیوەندی (لە، ژ) دەکەوێتە نێوان هەردوو ناوەکە.

پ- کاتێ سەیری ڕستەکانی بەشی (پ) دەکەین، دەبینین وشەکانی هێلیان بە ژێرەوەیە (بڵندترین، هەرە زیرەك، ژ هەمیا مەزنتر، لە گشت خوێندکاران باشتر، لە هەموو خوێندکاران هێمنتر). هاوەڵناوی چۆنییەتین‌و لە پلەی باڵادان، چونکە هەر یەکەیان پلەی باڵایی ناوێك پیشاندەدات لەنێوان ئەو ناوانەی کە هەموویان لە سیفەتەکە هاوبەشن، بەڵام پلەی یەکێکیان لە هەموویان پترە. بە دانانی نیشانەی (ترین) لە کۆتایی هاوەڵناوی چۆنییەتی دروستدەکرێت.

هەروەها دەتوانرێ بەهۆی وشەی (هەرە) یا (ژهەمیا) یا (لە گشت) یا (لە هەموو) پلەی باڵا دروست بکرێ، کە دەخرێتە پێش هاوەڵناوی پلەی بەراورد یا چەسپاو.

## دەستور:

**هاوەڵناوی چۆنییەتی سێ پلەی هەیە:**

ئـ- **پلەی چەسپاو:** ئەو هاوەڵناوەیە کە بۆ وەسفی ناوێک یا جێناوێک بەکاردەهێنرێ.

ب- **پلەی بەراورد:** ئەو هاوەڵناوەیە کە بۆ بەراوردکردن لەنێوان دوو ناوی وەسفکراو بەکاردەهێنرێ، کە هەردووکیان لە سیفەتەکە هاوبەشن، بەڵام پلەی یەکێکیان لەوی تر پترە. نیشانەی (تر) دەخرێتە کۆتایی هاوەڵناوی چۆنییەتیو ئامرازی پەیوەندی (لە، ژ) دەخرێتە نێوان هەردوو ناوی بەراوردکراو.

پ- **پلەی باڵا:** ئەو هاوەڵناوەیە کە پلەی باڵایی ناوێک پیشاندەدات لەنێوان کۆمەڵە ناوێک، کە هەموویان لە سیفەتەکە هاوبەشن ، بەڵام پلەی یەکێکیان لە هەموویان زیاترە.

١. بە دانانی نیشانەی (ترین) لە کۆتایی هاوەڵناوی چۆنییەتی دروست دەکرێ.

٢. دەتوانرێ بەهۆی وشەی (هەرە) کە دەخرێتە پێش هاوەڵناوی پلەی چەسپاو دروست بکرێ.

**٣. دەتوانرێ بە یارمەتی وشەی ( ژ هەمیا، لە گشت، لە هەموو، ژ تەڤ ) کە دەخرێتە پێش هاوەڵناوی پلەی بەراورد دروست بکرێ.**

## ڕاهێنانی (١)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. جۆ لە گەنم هەرزانترە. (پلەی باڵا، پلەی بەراورد، پلەی چەسپاو)

٢. نێرگز جوانترین گوڵی بەهارە.(پلەی باڵا، پلەی بەراورد، پلەی چەسپاو)

٣. ئاوی کانییەکە سارد بوو. (پلەی باڵا، پلەی بەراورد، پلەی چەسپاو)

٤. شاخی هەڵگورد لە شاخی سەفین بەرزترە.(پلەی چەسپاو، پلەی باڵا، پلەی بەراورد)

٥. ئەم ئەسپە خێرایە.(پلەی باڵا، پلەی بەراورد، پلەی چەسپاو)

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا هاوەڵناوی چۆنییەتی دەربهێنەو پلەکانیان دیار بخە:

١. پیاوی ئازا چاونەترسە.

٢. سەردار ژ نەوزادی خۆشمێرترە.

٣. شاسوار لەم پۆلەدا باشترین قوتابییە.

٤. ئەڤ گولە ژ هەمیا جوانترە.

٥. ئەڤین لە گشت قوتابییان زیرەکترە.

٦. شێرۆ ژ میرانی مەزنتر بوو.

## ڕاهێنانی (٣)

چۆن هاوەڵناوی پلەی بەراورد لە هاوەڵناوی پلەی باڵا جیا دەکەیتەوە؟ بە نمونە ڕوونیبکەوە.

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

١. زەریا لە دەریا قوڵترە.

٢. هاوین گەرمترین وەرزی ساڵە.

(وانەی یازدەهەم)

## هاوەڵناوی نیشانە

ئـ-

١. ئەم گوڵە جوانە.

٢. ئەو گوڵە جوانە.

٣. ئەم دارانە بەرزن.

٤. ئەو دارانە بەرزن.

٥. ئەڤ کوڕەیێ زیرەکە.

٦. ڤی خورتی سەرێ مە بلندکر.

٧. ڤێ کچێ هۆزانەك ڤەهاند.

٨. وی جامێری هاریکاریا مە کر.

٩. وێ گۆتنێ دلێ مە خۆشکر.

١٠. ئەڤان مرۆڤان نان خار.

١١. وان جوتیاران زەڤیێن خۆ کێلان.

ب-

١. ئەم دێیە گەورەیە.

٢. ئەو دێیانە گەورەن.

٣. ئەم کەیبانووە خاوێنە.

٤. ئەو کەیبانووانە خاوێنن.

## خستنەڕوو:

ئـ- کاتێ سەیری ڕستەکان دەکەین، دەبینین وشەکانی (ئەم...ە، ئەو... ە، ئەڤ ... ە ، ڤی ... ی، ڤێ ... ێ، وی... ی، وێ... ێ، ئەڤان... ان، وان ...ان) هەموویان هاوەڵناوی نیشانەن، چونکە هەریەکەیان وەسفی ناوێکی کردووە، بەهۆی دەستنیشانکردنەوە لە هاوچەشنەکانی خۆیدا جیایکردووەتەوە.

١. لە ڕستەی یەکەمدا هاوەڵناوی نیشانەی (ئەم... ە) بۆ نزیک بەکاردێت، وشەی (گوڵ)ی دەستنیشانکردووە، وەکو سیفەتێك توانیویەتی لە هاوچەشنەکانی خۆیدا جیای بکاتەوەو بووەتە دیارخەری ناوی (گوڵ).

٢. لە ڕستەی دووەمدا هاوەڵناوی نیشانەی (ئەو...ە) بۆ دوور بەکاردێت، وشەی (گوڵ)ی دەستنیشانکردووە، وەکو سیفەتێك توانیویەتی لە هاوچەشنەکانی خۆیدا جیای بکاتەوەو بووەتە دیارخەری ناوی (گوڵ).

٣. لە ڕستەی سێیەمدا هاوەڵناوی نیشانەی (ئەم... ە ) بۆ نزیک بەکاردێتو وشەی (داران)ی دەستنیشانکردووە، وەکو سیفەتێك توانیویەتی لە هاوچەشنەکانی خۆیدا جیای بکاتەوەو بووەتە دیارخەری ناوی (داران).

٤. لە ڕستەی چوارەمدا هاوەڵناوی نیشانەی (ئەو... ە) بۆ دوور بەکاردێتو وشەی (داران)ی دەستنیشانکردووە، وەکو سیفەتێك

توانیویەتی لە هاوچەشنەکانی خۆیدا جیای بکاتەوەو بووەتە دیارخەری ناوی (داران).

٥. لە ڕستەی پێنجەمدا هاوەڵناوی نیشانەی (ئەڤ ... ە ) بۆ نزیك بەکاردێت، وشەی (کوڕ)ی دەستنیشانکردووە، وەکو سیفەتێك توانیویەتی لە هاوچەشنەکانی خۆی جیای بکاتەوەو بووەتە دیارخەری ناوی (کوڕ).

٦. لە ڕستەی شەشەمدا هاوەڵناوی نیشانەی (ڤی... ی) بۆ ناوی نێری تاکی نزیك بەکاردێتو وشەی (خورت)ی دەستنیشانکردووە، وەکو سیفەتێك توانیویەتی لە هاوچەشنەکانی خۆیدا جیای بکاتەوەو بووەتە دیارخەری ناوی (خورت).

٧. لە ڕستەی حەوتەمدا هاوەڵناوی نیشانەی (ڤێ... ێ) بۆ ناوی مێی تاکی نزیك بەکاردێت، وشەی (کچ)ی دەستنیشانکردووە، وەکو سیفەتێك توانیویەتی لە هاوچەشنەکانی خۆیدا جیای بکاتەوەو بووەتە دیارخەری ناوی (کچ).

٨. لە ڕستەی هەشتەمدا هاوەڵناوی نیشانەی (وی... ی) بۆ ناوی نێری تاکی دوور بەکاردێت. وشەی (جامێر)ی دەستنیشانکردووە، وەکو سیفەتێك توانیویەتی لەناو هاوچەشنەکانی خۆیدا جیای بکاتەوەو بووەتە دیارخەری ناوی (جامێر).

٩. لە ڕستەی نۆیەمدا هاوەڵناوی نیشانەی (وێ... ێ ) بۆ ناوی مێی تاکی دوور بەکاردێت، وشەی (گۆتن)ی دەستنیشانکردووە، وەکو

سـيفەتێك توانيويـەتی لـەناو هاوچەشـنەكانی خۆيـدا، جيـای بكاتەوەو بووەتە ديارخەری وشەی (گۆتن).

١٠. لە ڕستەی دەيەمدا هاوەڵناوی نيشانەی (ئـەڤان... ان ) بـۆ نـاوی نێـرو مێـی كـۆی نزيـك بـەكاردێت، وشـەی (مـرۆڤ)ی دەستنيشانكردووە وەكو سيفەتێك توانيويەتی لە هاوچەشـنەكانی خۆيدا جيای بكاتەوەو بووەتە ديارخەری ناوی (مرۆڤ).

١١. لە ڕستەی يازدەهەمدا هاوەڵنـاوی نيشـانەی (وان... ان) بـۆ نـاوی نێـرو مـێی كـۆی دوور بـەكاردێت. وشـەی (جوتيـار)ی دەستنيشـانكردووە، وەكـو سـيفەتێك توانيويـەتی لـەناو هاوچەشنەكانی خۆيدا جيـای بكاتـەوەو بووەتـە ديارخـەری نـاوی (جوتيار).

ب- لە ڕستەكانی (ب)دا وشەكانی (دێ، كەيبانوو) دوو ناون بە پيتی بزوێنی (ێ، وو ) كۆتاييان هاتووە، هەروەها هاوەڵنـاوی نيشـانەكەش (ئەم... ە ) و (ئەو... ە ) بە پيتی بزوێنـی (ە) كۆتـايی هـاتووە، بـۆ ئـەوەی دوو بـزوێن بـە دوای يەكـدا نەيـەن، ئـەوا ناوبەنـدی گونجـاو دەخەينە نێوانيانەوە، ئەو كاتە بەپێی مەبەست بەكاريان دێنين:

( ئەم + دێ + يـ + ە )

( ئەو + كەيبانوو[١] + و+ ە )

---

[١] - (وو-û) خۆی كورتدەكاتەوە بۆ (و-u) Keybanuwe

## دەستور:

**هاوەڵناوی نیشانە:** ئەو هاوەڵناوەیە کە وەسفی ناوێك دەکاتو بە ئاسانی لە هاوچەشنەکانی خۆی جیای دەکاتەوەو دەبێتە دیارخەری ناوەکە، هەمیشە ناوە دەستنیشانکراوەکە دەکەوێتە نێوان هەردوو بەشی هاوەڵناوەکەوە.

**هاوەڵناوەکانی نیشانە لە زمانی کوردیدا ئەمانەن:**

| | | |
|---|---|---|
| ١. ئەم .... ە | ٢. ئەو... ە | ٣. ئەڤ ... ە |
| ٤. ڤی... ی | ٥. ڤێ ... ێ | ٦. وی ... ی |
| ٧. وێ... ێ | ٨. ئەڤان... ان | ٩. وان ... ان |



## ڕاهێنانی (١)

**نمونە:**

١. مندالّ (هەژار). ئەم منداڵە هەژارە پێویستی بە یارمەتی هەیە.

٢. دۆ (شیرین). ئەم دۆیە زۆر شیرینە.

ئەمانەی خوارەوە لەگەڵ هاوەڵناوی نیشانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

{ دەرگا (پان)، پەنیر (بەتام)، ئاو (سارد)، دەریا (قووڵ)، ئاگر (خۆش)، درەخت (بەرز)، بەڕوو (شیرین)، پیاو (ئازا)، کەو (گەردن بە خاڵ)}

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا هاوەڵناوی نیشانە دەربهێنە:

١. ئەو گۆڤارانە بهێنە.

٢. ڤێ دەفتەرێ بکرە.

٣. ئەم نەمامەم چاندووە.

٤. وی هەڤالی فراڤین خار.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم هاوەڵناوە نیشانانەی خوارەوە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(وان... ان، ئەڤان ...ان، وێ... ێ، ئەم...ە، ئەو... ە )

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستانەشلۆڤەبکە:

١. ئەم خانووە خۆشە.

٢. ئەو وێنانە ڕەنگدەکەم.

٣. وێ کابانێ مالەکا مەزن بڕێڤەبر.

(وانەی دوازدەهەم)

# جێناوی نـیشانە

١. ئەمە بنووسەوە.

٢. ئەوە زیرەکە.

٣. ئەمانە چالاکانە کاردەکەن.

٤. ئەوانە دەناسم.

٥. ئەڤە هەڤالێ منە.

٦. ڤی نان خاریبە.

٧. ڤێ نان خاریبە.

٨. وی چیرۆك نڤیسییە.

٩. وێ چیرۆك نڤیسییە.

١٠. ئەڤان (ڤان) گۆڤەندەکا خۆش گرێدا.

١١. (ئەوان) ڕەشبەلەك گرێدا.

١٢. وان بترسینە داکو بەس کارێ خراپ بکەن.

## خستنەڕوو:

کـاتێ سـەیری ڕسـتەکان دەکـەین، دەبیـنین وشـەکانی هێلیـان بەژێرەوەیە {ئەمـە، ئـەوە، ئەمانـە، ئەوانـە، ئەڤـە، ڤـی، ڤـێ، وی، وێ، ئـەڤان (ڤـان)، ئـەوان (وان)} هـەموویان جێنـاوی نیشـانەن، چـونکە هەریەکـەیان جێـی نـاوێکی گرتۆتـەوەو لـەبری ئـەو بـەکار هـاتووەو دەستنیشانی کردووە.

١. لە ڕستەی یەکەمدا جێناوی نیشانە (ئەمە) بۆ تاکی نزیک بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەستنیشانی کردووە.

٢. لە ڕستەی دووەمدا جێناوی نیشانە (ئەوە) بۆ تاکی دوور بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەستنیشانی کردووە.

٣. لە ڕستەی سێیەمدا جێناوی نیشانە (ئەمانە) بۆ کۆی نزیک بەکارهاتووە، جێی چەند ناوێکی گرتۆتەوەو دەستنیشانی کردوون.

٤. لە ڕستەی چوارەمدا جێناوی نیشانە (ئەوانە) بۆ کۆی دوور بەکارهاتووە، جێی چەند ناوێکی گرتۆتەوەو دەستنیشانی کردوون.

٥. لە ڕستەی پێنجەمدا جێناوی نیشانە (ئەڤە) بۆ تاکی نزیک بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەستنیشانی کردووە.

٦. لە ڕستەی شەشەمدا جێناوی نیشانەی (ڤی) بۆ نێری تاکی نزیک بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەستنیشانی کردووە.

٧. لە ڕستەی حەوتەمدا جێناوی (ڤێ) بۆ مێی تاکی نزیك بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەستنیشانیکردووە.

٨. لە ڕستەی هەشتەمدا جێناوی نیشانە (وی) بۆ نێری تاکی دوور بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەستنیشانی کردووە.

٩. لە ڕستەی نۆیەمدا جێناوی نیشانە (وێ) بۆ مێی تاکی دوور بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەستنیشانی کردووە.

١٠. لە ڕستەی دەیەمدا جێناوی نیشانە (ئەڤان، ڤان) بۆ نێرو مێی کۆی نزیك بەکارهاتووە، جێی چەند ناوێکی گرتۆتەوەو دەستنیشانی کردوون.

١١.له ڕستەی یانزەیەمدا جێناوی نیشانە (ئەوان، وان) بۆ نێرو مێی کۆی دوور بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەستنیشانی کردوون.

## دەستور:

**جێناوی نیشانە وشەیەکە جێی ناوێك دەگرێتو لە بری ئەو بەکاردێتو دەستنیشانی دەکات و لە ڕستەدا هەمان ئەرکی ڕێزمانی ناوەکە دەبینێت. زۆربەی جێناوە نیشانەکان ئەمانەن: (ئەمە، ئەوە، ئەمانە، ئەوانە، ئەڤە، ڤی، ڤێ، وێ، ئەڤان، وان ).**




## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا جێناوی نیشانە دەربهێنە:

١. ئەوەیان هەڵبژاردووە.

٢. ئەمەم بۆ بهێنە.

٣. ئەڤە سەیدایێ مەیە.

٤. ئەوانە زیرەکن.

٥. ڤی نڤیسییە.

٦. ڤان زەڤیێن خۆ کێلان.

## ڕاهێنانی (٢)

وەلامی ڕاست هەلبژێرە:

١.ئەم زەوییە بەپیتە.

(جێناوی نیشانەیە، هاوەلناوی نیشانەیە، جێناوی کەسی سەربەخۆییە)

٢. ئەوە شاخی قەندیلە.

(هاوەلناوی نیشانەیە، جێناوی نیشانەیە، جێناوی کەسی سەربەخۆییە)

٣. ئەو بەرگری لە خاکەکەی دەکات.

(هاوەلناوی نیشانەیە، جێناوی نیشانەیە، جێناوی کەسی سەربەخۆییە)

٤.ئەمانە نەوەی دوارۆژن.

(جێناوی کەسی سەربەخۆییە، جێناوی نیشانەیە، هاوەلناوی نیشانەیە)

٥.ئەڤ خورتە چەلەنگە.

(جێناوی نیشانەیە، جێناوی کەسی سەربەخۆییە، هاوەلناوی نیشانەیە)

## ڕاهێنانی (٣)

شەش ڕستە بهێنەوە، کە جێناوی نیشانەی تێدا بێت، سێیانیان بۆ نزیکو سێیانیان بۆ دوور بێت.

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شلۆڤەبکە:

١. ئەمە بۆ قوتابخانە هاتبوو.

٢. ڤی گەنم چاندییە.

٣. ئەڤان ستران گۆتنو وان لێ ڤەگێرا.

٤. ئەڤە تاڵە، ئەڤانە شرینن.

(وانەی سێزدەهەم)

# جیاوازی
# هاوەڵناوی نیشانەو جێناوی نیشانە

ئـ/

١. ئەم قوتابییە هۆنراوەکەی ئەزبەرکردووە.

٢. ئەڤ رەزە یێ مەیە.

٣. ئەو نەمامانە بچێنە.

٤. ڤێ زەڤییێ بەرهەمەك باش هەیە.

٥. ئەڤان گولان بچینە.

٦. وی رەزڤانی رەزێ خۆ فرۆت.

٧. ڤێ قوتابییێ وانە باش خاند.

ب/

١. ئەمە کتێبەکەی هێنا.

٢. ئەوانە کارەکەیان تەواوکرد.

٣. ئەڤە بوو شەڤێ دی هاتە مالا وە.

٤. ڤی گول چاندییە.

٥. ڤێ کراسەك کڕییە.

٦. ئەڤان پارە وەرگرت.

٧. وان فراڤین خواردبوو.

## خستنەڕوو:

ئـ- پێشتر زانیمان، کە هاوەڵناوی نیشانە وشـەیەکە ناوێـك دەستنیشـان دەکـات و وەك سـیفەتێك دەبێتـە دیارخـەری ناوەکـە. ئـەمجا ئەگـەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) بکەین، دەبینین کە هاوەڵناوی نیشـانە (ئەم...ە، ئەڤ ... ە، ئەو... ە، ڤێ... ێ، وی... ی، ئـەڤان... ان ). هـەر یەکـەیان نـاوێکی دەستنیشـان کـردووەو بووەتـە دیارخـەری ناوەکـە. نـاوە دیارخراوەکـە (دەستنیشـان کـراو) کەوتۆتـە نێـوان هەردوو کەرتی هاوەڵناوی نیشانە.

ب- لەمەو پـێش زانیمـان، کـە جێنـاوی نیشـانە وشـەیەکە جێـی ناوێـك دەگرێـتو ناوەکـەش دەستنیشـان دەکـات. ئینجـا ئەگـەر سـەیری ڕسـتەکانی بەشـی (ب) بکـەین، دەبیـنین جێنـاوی نیشـانە (ئەمـە، ئەوانە، ئەڤە، ئەڤە، ڤی، ڤێ، ئەڤان، وان) هەر یەکەیان جێی نـاوێکی گرتووەو لەبری ئەو بەکارهاتووەو دەستنیشانی کردووە.

## دەستور:

**جیاکردنـەوەی هاوەڵنـاوی نیشـانەو جێنـاوی نیشـانە لـە یـەکتری بـەم شێوە دەبێت.**

**١. هاوەڵناوی نیشانە وشەیەکە دوو کەرتە، ناوێك دەکەوێتە نێوانیان، بەڵام جێناوی نیشانە وشەیەکە شوێنی ناوێك دەگرێتەوە.**

**٢. ناوی دەستنیشانکراو لە هاوەڵناوی نیشانە باسدەکرێتو دەکەوێتە نێوان هەردوو کەرتییەوە، بەڵام لە جێناوی نیشانەدا ناوی دەست نیشانکراو باس ناکرێت.**

**٣. هاوەڵناوی نیشانە لە پاڵ ناوێك دێتو دەبێتە دیارخەری، بەڵام جێناوی نیشانە جێی ناوێك دەگرێتو لە بری ئەو بەکاردێت.**

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەدا هاوەڵناوی نیشانەو جێناوی نیشانە دیاربخە.

١. ئەڤە وارێ مەیە.

٢. ئەم کتێبەم خوێندووەتەوە.

٣. ئەوانە مێوانەکانن.

٤. ڤی خەباتکەری خەلات بکە.

٥. کولیکێن ناڤ وان ڕەزا، جانن.

٦. کەی ئەمە تەواو دەکەیت؟

٧. ڤان شڤانان پەزێ خۆ ئاڤدا.

٨. ڤێ زەڤی فرۆتییە.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم وشانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە بە مەرجێك جارێك هاوەڵناوی نیشانەبنو جارێك جێناوی نیشانە بن.

( وی، وان، ڤان، وێ، ڤی)

## ڕاهێنانی (٣)

چۆن هاوەڵناوی نیشانە لە جێناوی نیشانە جیادەکەیتەوە؟ بە نمونـە ڕوونی بکەوە.

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شلۆڤەبکە:

١. وێ پەرتوکێ بکرە.

٢. ئەوە کاغەزەکەی هێنا.

٣. ئەڤان چیرۆکنڤیسان چیرۆك نڤیسی.

٤. ئەوانە بۆ من دابنێ.

# هـاوەڵـکار

١. دوهی بەفر باری.

٢. دەرسەکەمان خێرا تەواوبوو.

٣. ئازادی کەو د ناڤ هێلینێدا گرت.

## خستنەڕوو:

ئەگـەر سـەیری ڕسـتەکان بکـەین‌و لـە کارەکانیـان بـاش وردببینـەوە دەبینین:

- لە ڕستەی یەکەمدا دەمانتوانی بڵێین (بەفر باری) بەڵام بـۆ ئـەوەی سـنورێك بـۆ دەمـی ڕوودانـی کـاری ڕسـتەکە دابنـێین هاوەڵکـاری (دوهـی)مـان بـەکارهێناوە، بەهۆیـەوە توانیمـان کـاتی ڕوودانـی کارەکە ئاشکرا بکەین.
- لـە ڕسـتەی دووەمـدا مـەڤیا چـەوانییا وێ تـەواوبوونێ دەربخـەین لەبەر ئەوە هاوەڵکاری (خێـرا)مـان بـەکارهێناوەو سـنورێکمان بـۆ واتای کارەکە دانا.
- لـە ڕسـتەی سـێیەمدا ویسـتومانە شـوێنی ڕوودانـی کارەکـە، کـە گرتنەکەیـــە پیشـــانبدەین بۆیـــە هـــاتووین هاوەڵکـــاری (دنـاڤ هێلینـێ)مـان بـەکارهێناوە، کـە بەهۆیـەوە سـنورێکمان بـۆ شوێنی ڕوودانی کارەکە داناوە.

## دەستور:

**هاوەڵکـــار/ پەیڤەکـــە ڕوویـــەکی ڕوودانـــی کـــاری ڕســـتە دەربـــارەی (چۆنییەتی ئەو ڕوودانە، کاتی، شوێنی) کاری ڕستەکە دەردەخاتو لەم ڕووەوە سنورێك بۆ تەواوکردنی واتاکەی دادەنێت و دەبێتە تەواوکەری کارەکە لە ڕستەدا.**

وانەی پازدەهەم

# جۆرەکانی هاوەڵکار

### ١) هاوەڵکاری کاتی

١. دوهی جوتیاری گەنم جەنجەڕ[1]کرد.
٢. ئەمڕۆ گەلانی جیهان بۆ ئاشتی تێدەکۆشن.
٣.ساڵەکا دی پەیمان دێ چێتە زانکۆ.
٤. ئەوان ئێستا نانەکەیان دەخۆن.
٥. بەزستان پینەو پەڕۆ، بەهاوینان وردورد بڕۆ.

### ٢) هاوەڵکاری شوێنی

١. منداڵەکە لەسەربان نوست.
٢. مەلەڤان دناڤ ئاڤێدا بوو.
٣. پشیلەکە لە قوژبنی ژوورەکەدا هەڵتووتابوو.
٤. قوتابییەکە لەبن دارێ دخوێنیت.
٥. ئاکام لەتەنیشت منەوە وەستابوو.

### ٣) هاوەڵکاری چۆنییەتی

١. پیاوەکە دەرگاکەی توند پێوەدا.
٢. ڕووداوەکەی لەسەرخۆ گێڕایەوە.
٣. نازدار بلەز چوو قوتابخانێ.
٤. مامۆستا بەپێکەنینەوە هاتە ژوورەوە.
٥. فراڤینێ ب گەرمی بخۆ.
٦. ڕۆژنامەکەی بەخۆڕایی هێناوە.

---

[1] جەنجەرکرد : گێرەکرد

## خستنەڕوو:

١. لە زنجیرە ڕستەکانی بەشی (١)دا هاوەڵکاری ( دوهی، ئەمڕۆ، ساڵەکا دی، ئێستا، بەزستان، بەهاوینان) هەریەکەیان سنورێك بۆ ڕوودانی کارەکەیان دادەنێن‌و لەم ڕووەوە دەبنە تەواوکەری کارەکان، جا بەو وشەیەی کە کاتی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەردەخات‌و واتاکەشی تەواو دەکات دەگوترێت (هاوەڵکاری کاتی).

٢. لە زنجیرە ڕستەکانی بەشی (٢)دا هاوەڵکاری (لەسەربان، دناڤ ئاڤێدا، لەقوژبنی ژوورەکەدا، لەبن داری، لەتەنیشت) هەر یەکەیان سنوورێك بۆ ڕوودانی واتای کارەکان دادەنێن‌و لەم ڕووەوە دەبنە تەواوکەری کارەکان، جا ئەو وشەیەی کە شوێنی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەردەخات‌و واتاکەشی تەواودەکات، پێدەگوترێت (هاوەڵکاری شوێنی).

٣. لە زنجیرە ڕستەکانی بەشی (٣)دا هاوەڵکاری (توند، لەسەرخۆ، بلەز، بەپێکەنینەوە، ب گەرمی، بەخۆرایی) هەر یەکەیان سنورێك بۆ ڕوودانی واتای کارەکان دادەنێن‌و لەم ڕووەوە دەبنە تەواوکەری کارەکان، جا بەو وشەیە، کە چۆنییەتی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەردەخات‌و واتاکەشی تەواودەکات، دەگوترێت (هاوەڵکاری چۆنییەتی).

## دەستور:

١. هاوەڵکاری کاتی: وشەیەکە (یان چەند وشەیەکە) کاتی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەردەخاتو دەبێتە تەواوکەری کارەکە بۆ نمونە ئەمانەی خوارەوە هاوەڵکاری کاتین.

(دوێنێ، پێرێ، ڕۆژی هەینی، مانگی گوڵان، نهۆ (ئێستا)، لەمەوپێش، پارشێو، ئێوارە، ئەمساڵ... ).

٢. هاوەڵکاری شوێنی: وشەیەکە (یان چەند وشەیەکە) شوێنی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەردەخاتو دەبێتە تەواوکەری کارەکە. بۆ نمونە ئەمانەی خوارەوە هاوەڵکاری شوێنین.

(خوار، تەنیشت، لەژێر، بەردەم، ڕاست، چەپ... ).

٣. هاوەڵکاری چۆنییەتی: وشەیەکە (یا چەند وشەیەکە) چۆنییەتی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەردەخاتو دەبێتە تەواوکەری کارەکە، بۆ نمونە ئەمانەی خوارەوە هاوەڵکاری چۆنییەتین.

(خێرا، هێدی، بەگوڕ، توند، لەسەرخۆ، بەزیری، بەچاکی، بەپەلە، بەنازداری، بەهێمنی، ب ساردی، ب خۆشی....).

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا هاوەڵکاری (کاتی، شوێنی، چۆنییەتی) دیار بکە:

١. لەمێژە گەلی کورد دژی داگیرکەر وەستاوە.

٢. خوناڤ ب سەرفرازی ژ ئەزمونێ دەرباز بوو.

٣. کتێبەکەم لەناو جانتاکەدا دانا.

٤. بەهاوین زۆربەی خەڵك ل سەربان دنڤن.

٥. ئەڤرۆ دڤێت کوردستان ژ هەموو لایاڤە پێش بکەڤیت.

٦. ڕۆژانی هەینی دەچن بۆ سەیران.

٧. کچەکەیان بە هێمنی کارەکانی ڕادەپەڕێنێت.

٨. باران بەخوڕ دەبارێت.

٩. دوێنێ هاتم بۆ لات، لە ماڵ نەبوویت.

١٠. ئۆتۆمبیلەکە بەگوڕ بە لاماندا تێپەڕی.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم هاوەڵکارانەی خوارەوە چ جۆرێکن، لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە:

(لەناو باخەکەدا، پار، بەجوانی، هەفتەی داهاتوو، باش، بەربانگ، پیاوانە، لەژێر درەختەکە).

## ڕاهێنانی (٣)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. بەدڵ و بەگیان کوردستان دەپارێزین.(ھ.شوێن، ھ.کات، ھ.چۆنییەتی)

٢. گوندەکە لەسەر گردەکە بوو. (ھ.شوێن، ھ.چۆنییەتی، ھ.کاتی)

٣. بەیانی زوو کەڵەشێرەکە دەیخوێند. (ھ.کات، ھ.شوێن، ھ.چۆنییەتی)

٤. لەمەودوا کاری خراپ ناکەین. (ھ.چۆنییەتی، ھ.شوێن، ھ.کاتی)

٥. بەجوانی وەڵام بدەرەوە. (ھ.کات، ھ.شوێن، ھ.چۆنییەتی)

٦. کیسەڵەکە لەسەرخۆ دەڕوات. (ھ.چۆنییەتی، ھ.کاتی، ھ.شوێن)

## ڕاهێنانی (٤)

١. شلۆڤەکردن:

ڕۆژنامەکەم بە پاڵکەوتنەوە خوێندووەتەوە.

ڕۆژنامەکە: ناوە، تاکە، گشتییە، ناسراوە، بەرکارە.

م: جێناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی تاک بکەرە.

بەپاڵکەوتنەوە: هاوەڵکاری چۆنیەتییە، تەواوکەری کاری ڕستەکەیە.

خوێندووەتەوە : کاری ڕابردووی تەواوی تێپەڕە.

٢. ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

ئـ- گەلی کوردستان لە پێنجی ئاداردا شێرانە ڕاپەڕی.

ب - دوێنی چووم بۆ ماڵی هاوڕێکەم.

(وانەی شازدەهەم)

# گرێی ناوی

ئەم ڕستانە بخوێنەوە:

١- **چرای ژوورەکە** داگیرسا. (بکەر)

٢- **چرای ژوورەکە** ڕوناکە. (نیهاد)

٣- **چرای ژوورەکە**م داگیرساند. (بەرکار)

٤- ڕوناکی لە **چرای ژوورەکە** دێت. (تەواوکەری بەیاریدە)

٥- ئەوە **چرای ژوورەکە**یە. (تەواوکەری کاری ناتەواو)

٦- تیشکی **چرای ژوورەکە** ڕوناکە. (دیارخەری ناو)

٧- **چرای ژوورەکە** کزکرا. (جێگری بکەر)

## خستنەڕوو:

ئەگەر سەیری ڕستەکان بکەین دەبینین ئەو گرێیانەی کە هێڵیان بە ژێرداهاتووە پێکهاتەیەکی دیاریکراویان هەیە و هەریەکێکیان ئەرکێکی جیاوازی وەرگرتووە.

لە ڕستەی یەکەمدا (**چرای ژوورەکە داگیرسا**)، (چرای ژوورەکە)، گرێیەکی ناوییە، چونکە لە هەردوو ناوی (چرا) و (ژوورەکە) بە یارمەتی ئامرازی دانەپاڵ پێکهاتووە. ئەرکی (بکەر)یشی بینیوە، چونکە کاری (داگیرسان)ی ئەنجامداوە، واتە کارێکی ئەنجامداوەو کارەکەش تەواوە.

لە ڕستەی دووەمدا (**چرای ژوورەکە ڕوناکە**) بە هەمان شێوە (چرای ژوورەکە) گرێیەکی ناوییە، ئەرکی (نیهاد)ی بینیوە، چونکە سیفەتێکی دراوەتەپاڵ و کارەکەی ناتەواوە.

لە ڕستەی سێیەمدا (**چرای ژوورەکەم داگیرساند**) گرێی ناویی (چرای ژوورەکە) ئەرکی (بەرکار)ی بینیوە، چونکە کاری (داگیرساند)ی بەسەر داهاتووە. واتە کاریگەری کارەکەی کەوتووەتە سەر.

لە ڕستەی چوارەمدا (ڕوناکی لە چرای ژوورەکە دێت) گرێی ناویی(چرای ژوورەکە) ئەرکی (تەواوکەری بەیاریدە)ی بینیوە، چونکە بە یارمەتی ئامرازی پەیوەندی (لە) واتای کارەکەی تەواوکردووە.

لە ڕستەی پێنجەمدا (ئەوە چرای ژوورەکەیە) گرێی ناویی(چرای ژوورەکە) ئەرکی (تەواوکەری کاری ناتەواو)ی بینیوە، چونکە واتای کاری ناتەواوی (ە)ی بۆ کاتی ئێستا تەواوکردووە.

لە ڕستەی شەشەمدا (تیشکی چرای ژوورەکە ڕوناکە)، گرێی ناویی (چرای ژوورەکە) لە ئەرکی (دیارخەری ناو)دایەو بە یارمەتی ئامرازی دانەپاڵی (ی) بووەتە دیارخەری ناوی (تیشک).

لە ڕستەی حەوتەمدا (چرای ژوورەکە کزکرا)، گرێی ناویی (چرای ژوورەکە) لە ئەرکی (جێگری بکەر)دایە، چونکە لە شوێنی بکەر دانراوەو کارەکەشی بکەرنادیارە.

## دەستور:

**گرێی ناوی، کۆمەڵێك پەیڤن، بەسەر یەکەوەن، پەیوەندییەکی بەهێزیان لەگەڵ یەکتردا هەیە و هەموو ئەرکەکانی ناو دەبینین، هەر لەبەر ئەمەش پێیدەگوترێت گرێی ناوی.**

**دروستکردنی گرێی ناوی**

**گرێی ناوی بە چەند ڕێگایەك دروستدەکرێت، گرنگترینیان ئەمانەن :**

**١. دەکرێ گرێی ناوی لە دوو ناو پێکبێت بە یارمەتی ئامرازی دانەپاڵ دەخرێنە پاڵ یەکتر، وەك:**
**شاری هەولێر، گوڵی باخەکە، دارا هنارێ، درەختی دارستانەکە، گۆپاڵێ گاڤانی.**

**٢. دەکرێ لە ناوێك و جێناوێکی سەربەخۆ بە یارمەتی ئامرازی دانەپاڵ پێکبێت، وەك:**
**برای تۆ ، کتێبی ئەوان ، خانووی ئێمە**

**٣- دەکرێت لە ناوێك و هاوەڵناوێك بە یارمەتی ئامرازی دانەپاڵ پێکهاتبێت، وەك:**
**هەناری ترش، سێوی سوور، گۆڤاری نوێ، قوتابییە زیرەکەکان**

## راهێنانی (١)

لەم پارچەیەدا گرێی ناوی دەربهێنە:

شەوی زستان ناخۆشترین کات بوو لەلای ئەم دایکە هەژارە، خۆیو منداڵێکی ساوا لە ئامێزی تەنیایی شەوگاردا، سەرگەردان تا بەرەبەیان، ئەگەر بۆ ساتێکی کەمیش چاوی بچووایە خەو، خەونی بە گوندە رووخاوەکەیانو چیا بڵندەکانو بەفری کوێستانو گوڵە ژاڵەکەوە دەبینی.

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستانەدا گرێ ناوییەکان دەستنیشـان بکـەو ئەرکەکـەیان دیـاری بکە:

١. قوتابیی زیرەك خۆشەویستە.

٢. تەختەی ڕەش دەستمان پیسدەکات.

٣. ئەوان خانووە خۆشەکەیان فرۆشت.

٤. ترێ وشکەکە فرۆشرا.

٥. دەنگی کەوی کوێستان خۆشە.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم بۆشاییانە بە گرێی ناوی پڕ بکەرەوە:

١. ........... ترسناکە.

٢. ........... نە خواردەوە.

٣. نامەیەکم بە ........... ڕەوانەکرد.

٤. ........... لە هیچ سڵ ناکاتەوە.

٥. ........... بە یەکەم دەرچوو.

(وانەی حەڤدەهەم)

# گـرێی هاوەڵناوی

## ئەم ڕستانە بخوێنەوە:

١. شاری زۆر گەورەم بینی.

٢. ئێوەی گەلێك زیرەك سەردەكەون.

٣. تابلۆكە هەندێك جوانە.

٤. كورە زۆر ئازاكە هات.

٥. پردێكی جوان و پتەویان دروستكرد.

## خستنەڕوو:

گرێی هاوەڵناوی دەتوانێت هەموو ئەركەكانی هاوەڵناو ببێنێت، بەڵام ئـەوەی جیایـان دەكاتـەوە، تـەنیا شـێوەی پێكهاتنیانـە، كـە گرێـی هاوەڵناوی فراوانترەو لە ڕووی دروستبوونییەوە جیاوازە لـە هاوەڵنـاوی داڕژاوو لێكدراو.

ئەگەر سەیری ڕستەكان بكەین، دەبینین:

١. لـە ڕسـتەی یەكەمـدا (شـاری زۆر گـەورەم بینـی)، (زۆر گـەورە) گرێیەكی هاوەڵناوییە، لە هاوەڵنـاوی نادیاری (زۆر)و هاوەڵنـاوی چۆنیەتی(گەورە) دروستبووە، ئـەركی دیارخـەری نـاوی (شـار)ی بینیوە، چونكە وەسفی ناوەكەی كردووە.

٢. له ڕستەی دووەمدا (ئێوەی گەلێك زیرەك سەردەکەون)، (گەلێك زیرەك) گرێیەکی هاوەڵناوییە، لە هاوەڵناوی نادیاری (گەلێك)و هاوەڵناوی چۆنیەتی (زیرەك) پێکهاتووە. ئەرکی دیارخەری جێناوی سەربەخۆی (ئێوە)ی بینیوە، چونکە وەسفی جێناوەکەی کردووە.

٣. له ڕستەی سێیەمدا (تابلۆکە هەندێك جوانە)، (هەندێك جوان) گرێیەکی هاوەڵناوییە، لە هاوەڵناوی نادیاری (هەندێك)و هاوەڵناوی چۆنیەتی (جوان) پێکهاتووە. ئەرکی تەواوکەری کاری ناتەواوی (ە)ی بینیوە، چونکە واتای کارە ناتەواوەکەی تەواوکردووە.

٤. له ڕستەی چوارەمدا (کوڕە زۆر ئازاکە هات)، (زۆر ئازا) گرێیەکی هاوەڵناوییە، لە هاوەڵناوی نادیاری (زۆر)و هاوەڵناوی چۆنیەتی(ئازا) دروستبووە، ئەرکی دیارخەری ناوی (کوڕ)ی بینیوە، چونکە وەسفی ناوەکەی کردووە.

٥. لە ڕستەی پێنجەمدا (پردێکی جوانو پتەویان دروستکرد)، (جوانو پتەو) گرێیەکی هاوەڵناوییە لە هەردوو هاوەڵناوی چۆنیەتی (جوان ، پتەو) بە یارمەتی ئامرازی لێکدەری (و) دروستبووە. ئەرکی دیارخەری ناوی (پرد)ی بینیوە.

## دەستور:

**گرێی هاوەڵناوی کۆمەڵە پەیڤێك بەسەریەکەوە کە لە ڕستەدا ئەرکی هاوەڵناو دەبینێتو وەسفی ناو یان جێناو دەکات و لە ڕستەدا دەبێتە دیارخەری ناو و جێناو، هەروەها دەبێتە تەواوکەری کاری ناتەواو.**

**بەم شێوانە دروستدەکرێن:**

**١- { هاوەڵناوی نادیار[1] + هاوەڵناوی چۆنییەتی }**

**وەك: زۆرجوان، هەندێك خێرا، کەمێك بەپەلە .....**

**٢- { هاوەڵناوی چۆنیەتی+ئامرازی لێکدەر(و)+هاوەڵناوی چۆنییەتی}**

**وەك: زیرەكو لێهاتوو، خۆشو بەتام ، جوانو نوێ .......**

## ڕاهێنانی (١)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە گرێیەکی هاوەڵناوی پڕبکەرەوە:

١. مرۆڤی .......... بە ئاوات دەگات.

٢. لەگەڵ هاوڕێی .......... هەڵسوکەوت بکە.

٣. خاتوو میتران بە دۆستێکی .......... کورد دادەنرێت.

٤. میوەی .......... بخۆ.

---

[1] هاوەڵناوی نادیار : هەموو ، زۆر ، هەندێك ...)

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم بۆشاییانە بە گرێیەکی گونجاو پڕبکەرەوەو جۆرەکەشی بنووسە:

١. .......... ناخۆشە.

٢. کوڕە .......... ئامۆژمە.

٣. .......... دەکرم.

٤. کاغەز .......... دروست دەکرێت.

٥. دەبێت قوتابی ..........ت خۆش بوێت.

٦. .......... نووسی.

## ڕاهێنانی (٣)

بۆ هەر گرێیەکی (ناوی، هاوەڵناوی ، هاوەڵکاری) دوو ڕستە بهێنەرەوە.

## ڕاهێنانی (٤)

چۆن گرێی ناویو هاوەڵناویو هاوەڵکاری لێك جیادەکەیتەوە؟ بە نمونە ڕوونی بکەوە.

## ڕاهێنانی (٥)

لەم گرێیانەی خوارەوە جۆری گرێیەکە دیاربکەو لە ڕستەدا بەکاری بهێنە.

(زۆر خۆش، دوێنێ شەو، درەختی چیاکە، ، داری سێو، هەفتەی داهاتوو)

## ڕاهێنانی (٦)

جیاوازیی نێوان ئەمانەی خوارەوە ئاشکرا بکە:

١. ئـ- تەختە ڕەشەکەم سڕییەوە. ب- تەختەڕەش دەستمان پیسدەکات.

٢. ئـ- منداڵەکە زیرەکە. ب- منداڵە زیرەکەکە، چاودێری پۆلە.

٣. ئـ- هەرمێ لاسوورە ب- هەرمێی لاسوور

## ڕاهێنانی (٧)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شلۆڤەبکە:

١. کرێکارەکان دوێنێ ئێوارە لە کارگەی مافور گەڕانەوە.

٢. کچا گەلەك ژێر خارن ئامادەدکر.

# گرێی هاوەڵکاری

**١- ڕۆژی هەینی دەگەڕێینەوە.**

**٢- لەنزیك قەلاّ كاوەم دیت.**

**٣- یاریزانەكە زۆر خێرا هات.**

## خستنەڕوو:

ئەگەر سەیری ڕستەكان بكەین، دەبینین هەر یەكێكیان گرێیەكی هاوەڵكاری تێدایە.

١. لە ڕستەی ( ڕۆژی هەینی دەگەڕێینەوە)، (ڕۆژی هەینی)، گرێیەكی هاوەڵكاری كاتییە، چونكە كاتی ڕوودانی كاری ڕستەكە دەستنیشان دەكات، لە ڕووی دروستبوونەوە لە هەردوو ناوی (ڕۆژ) و (هەینی) بە یارمەتی ئامرازی دانەپاڵی (ی) پێكهاتووە، هەمووشیان بەسەر یەكەوە گرێیەكی هاوەڵكاری كاتییان دروستكردووە و بووەتە تەواوكەری كاری ڕستەكە.

٢. لە ڕستەی (لەنزیك قەلاّ كاوەم دیت)، (لەنزیك قەلاّ)، گرێیەكی هاوەڵكاری شوێنییە، چونكە شوێنی ڕوودانی كاری ڕستەكە دیاری دەكات، لە ڕووی پێكهاتنەوە لە هاوەڵكاری (لەنزیك) و ناوی (قەلاّ) دروستبووە، هەردووكیان بەیەكەوە گرێیەكی

هاوەڵکاری شوێنییان دروستکردووەو بووەتە تەواوکەری کاری ڕستەکە.

**٣.** لە ڕستەی (یاریزانەکە زۆر خێرا هات)، (زۆر خێرا) گرێیەکی هاوەڵکاری چۆنیەتییە، چونکە چۆنیەتی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەخاتەڕوو. لە ڕووی دروستبوونەوە لە هەردوو هاوەڵکاری (زۆر) و (خێرا) پێکهاتووە، هەردووکیان بەیەکەوە گرێیەکی هاوەڵکاری چۆنیەتییان دروستکردووە، کەبووەتە تەواوکەری کاری ڕستەکە.

## دەستور:

**گرێی هاوەڵکاری: کۆمەڵێك پەیڤی بەسەر یەکەوەن، بە تەنیا واتای تەواو نابەخشن، لە ڕستەدا لە ڕووی کاتی و شوێنی و چۆنیەتییەوە وەسفی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەکەن و دەبنە تەواوکەری کارەکە.**

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانە گرێی هاوەڵکاری دەربهێنە و جۆرەکەیان دیاریبکە:

١. بەیانی زوو سواری ئۆتومبێل دەبن.

٢. ئێمە لەناودۆڵەکە دانیشتین.

٣. لەمانگی جۆزەردانداا تاقیکردنەوە دەستپێدەکات.

٤. بایەکە کەمێك توند هەڵیکرد.

٥. بە کاتژمێرو نیوێك دەگەینە کەرکوك.

٦. منداڵەکە لەسەر کورسییەکە دانیشتووە.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم بۆشاییانە بە گرێی هاوەڵکاری پڕ بکەرەوە:

١. ............ سەفەر مەکە.

٢. دارا ............ نووستووە.

٣. ئەو ئەسپەم ............ کڕی.

٤. ............ بەهار دێت.

٥. ............ دامەنیشە.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

١. هەڵۆکە لەسەر بەردەکەوە نیشتبووەوە.

٢. باران گەلێك بەخوڕ دەبارێت.

٣. هەفتەی پێشوو ڕۆمانەکەمان خوێندەوە.

(وانەی نۆزدەهەم)

# کاری تێنەپەڕو کاری تێپەڕ

ئـ/

١. دلێر نقست.

٢. کۆترەکە دەفڕێت.

ب/

١. پێشمەرگە وەلاتی دپارێزیت.

٢. نەوزاد چیرۆکی نووسی.

## خستنەڕوو:

١. ئەگەر بڕوانینە ڕستەکانی بەشی (ئـ) دەبینین:

- کاری (نقست– دەفڕێت) هەر یەك ژوان خراونەتە پاڵ کەسێك یان شتێك واتە هەر یەك ژوان کارێکی هەیە.
- لە ڕستەی یەکەمدا کاری (نقست) کارێکی ڕابردووەو بە تەنیا شیایە واتای ڕستەکە تەواو بکاتو مەبەستی ڕستەکەش بدات بە دەستەوە.
- لە لایەکی ترەوە دەبینین ئەرکی کارەکە (نقست) لە (بکەر)کەوە (دلێر) تێناپەڕێتە سەر کەسێك یا شتێکی تر.

- له ڕستەی دووەمیشدا ئەرکی کاری (دەفڕێت) لە بکەری ڕستەکە تێناپەڕێتە سەر کەسێك یان شتێکی تر.

جا هەر کارێك کە بەتەنیا واتای ڕستەکە تەواو بکاتو ئەرکی لە (بکەر)ی کارەکەوە تێنەپەڕێتە سەر کەسێك یان شتێکی تر دبێژنێ (کاری تێنەپەڕ).

٢. ئەگەر بڕوانینە ڕستەکانی بەشی (ب) دەبینین:

لە ڕستەی یەکەمدا پەیڤی (دپارێزیت) کارەو بکەرەکەی (پێشمەرگە)یە. ئەگەر گوتبامان (پێشمەرگە دپارێزیت) نەمان دەزانی چی دپارێزێت؟

جا بۆ تەواوکردنی واتای ڕستەکە، کارەکە پێویستی بە تەواوکەرێك هەیە بۆ ئەوەی واتای ڕستەکە تەواو ئاشکرا بکات کە لەمەولا بەم تەواوکەرە دەبێژین (بەرکار).

هەروەها لە ڕستەی دووەمدا کاری (نووسی) پێویستی بە وشەیەکی تر هەیە تاکو واتای ڕستەکە تەواو ئاشکرا بکات، چونکە ئەگەر گوتبامان (نەوزاد نووسی) نەمان دەزانی چی نووسی؟ لەبەر ئەمە پەیڤی (چیرۆك) دەبێت بە بەرکار.

- لەلایەکی ترەوە دەبینین ئەرکی کارەکە کە (بکەر)ەکە ئەنجامی دەدات لە خۆیەوە تێدەپەڕێتو دەکەوێتە سەر (بەرکار)ەکە.
- جا هەر کارێك بە تەنیا لەگەڵ بکەرەکەی نەتوانێت واتای ڕستەیەك تەواو ئاشکرا بکاتو پێویستی بە پەیڤێکی تر بێت بۆ ئەم تەواوکردنە، پێیدەڵێین کاری (تێپەڕ).

## دەستور:

١. **کاری تێنە پەڕ:** ئەو کارەیە کە بە تەنیا دەتوانێت واتای ڕستەیەك تەواو بکاتو ئەرکی لە بکەری کارەکە تێناپەڕێتە سەر کەسێك یان شتێکی تر.

٢. **کاری تێنە پەڕ بە هیچ ڕەنگێك (بەرکار)** وەرناگرێت بەڵام دەتوانێت (تەواوکەری بەیاریدە) وەربگرێت وەکو: نیوار چوو بۆ هەولێر.

٣. **کاری تێپەڕ:** ئەو کارەیە بە تەنیا لەگەڵ بکەرەکەی نەشێت واتای ڕستەیەك تەواو ئاشکرا بکات بەڵکو پێویستی بە پەیڤێکی تر هەیە بۆ ئەم تەواوکردنە، ئەم پەیڤەش ئەرکی کارەکەی دەکەوێتە سەرو دەبێتە (بەرکار). یان کاری تێپەڕ: ئەو کارەیە کە ئەرکی لە (بکەر)ی کارەکەوە تێدەپەڕێتە سەر کەسێك یان شتێکی ترو دەبێتە تەواوکەری کارەکەو دبێژنێ (بەرکار).

٤. **کاری تێپەڕ:** ئەم کارە دەشێت (بەرکار)و (تەواوکەری بەیاریدە) وەربگرێت وەکو: جوتیار زەوی بە هەوجاڕ دەکێڵێت. لەم ڕستەیەدا پەیڤی (زەوی) بەرکارەو (هەوجاڕ) تەواوکەری بەیاریدەیە بۆ کاری (دەکێڵێت).

# کار

له ڕووی دروستکردن




هێز




واتا




کات



## ڕاهێنانی (١)

ئەم بۆشاییانە بە کارێکی تێپەڕ پڕبکەوە:

١. سێوەکەم ..........

٢. ئەو پیاوە خانوو دروست ..........

٣. تە چەند کەو ..........؟

٤. ئاڤان یا جلکا ..........

٥. دارا سێوەکە ..........

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم بۆشاییانە بە کارێکی تێنەپەڕ پڕبکەوە:

١. مللەت ب خاندنێ ..........

٢. گیا لەسەر بنجی خۆی ..........

٣. کۆترا شێردلی ..........

٤. لە هەموو هەورێك باران ..........

## ڕاهێنانی (٣)

وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە:

١. دەکڕین. (تێنەپەڕە، تێپەڕە)

٢. هات. (تێپەڕە، تێنەپەڕە)

٣. تەواودەکەم. (تێپەڕە، تێنەپەڕە)

٤. هەڵدەواسێت. (تێنەپەڕە، تێپەڕە)

٥. ڕایکرد. (تێپەڕە، تێنەپەڕە)

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم کارانە چ جۆرێکن؟ لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە:

( نووست، کەفت، دەبارێت، بخۆ، چاند، دەنووسین، ڕزی، هات ).

## ڕاهێنانی (٥)

### شیکردنەوە

١. ئێمە گۆرانییەکەمان بیست.

ئێمە: جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی یەکەمی کۆ، بکەرە.

گۆرانییەکە: ناوە، تاکە، ناسراوە ، بەرکارە.

مان: جێناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی کۆ، بۆ بکەر دەگەڕێتەوە.

بیست: کاری ڕابردووی نزیکە، تێپەڕە.

٢. ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

ئ – خشتەکە شکابوو.

ب– شڤانی پەز چەراند.

# ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| پێویست | : | پێتڤی |
| کاری تێنەپەڕ | : | کارێ دەرباز نەبووی |
| کاری تێپەڕ | : | کارێ دەرباز بووی |
| کاڵەك | : | گندۆر |
| گۆرانی | : | ستران |
| بیست | : | بیهست، گوهـ لێبوو |
| خشت | : | کەلپیچ، کەرپوچ،لگبن |
| شیا | : | توانی |
| پەیڤ | : | وشە |
| بنێرینە | : | سەرنج بدەینە، تەماشا بکەین، بنۆرینە |
| ژوان | : | لەوان |
| بەرکار | : | تەواوکەری ڕاستەوخۆ |
| پێی دبێژن | : | پێی دەگۆترێت، پێی دەڵێن |
| بێنێتە دی | : | بجە بینیت |
| سەخت | : | دژوار، ب زەحمەت |
| بنج | : | بنجو بناوان، بنەما، ڕەگ، ڕهـ |

(وانەی بیستەم)

# بەرکار

١. پشیلەکە گۆشت دەخوات.

٢. دارا خشت دەبڕێت.

٣. فەرهاد نووسراوەکەی خوێندەوە.

٤. نازدار نێرگز دەڕوێنێت.

## خستنەڕوو:

ڕستە لە دوو بنچینەی سەرەکی پێکدێت کە یەکێکیان بکەرەو ئەویتریان کارە، هەرچی لەوان زیاتر بێت پێیدەوترێت (دیارخەر)و (تەواوکەر). دیارخەر بەشی ناو تەواودەکات، تەواوکەریش بەشی کار تەواودەکات. بەرکار یەکێکە لە تەواوکەرەکانی کار.

ئەگەر سەرنجی ڕستەکانی سەرەوە بدەین، دەبینین وشەی (پشیلەکە، دارا، فەرهاد، نازدار) هەر یەکەیان لەو شوێنەدا بکەرە، هەروەها وشەی (دەخوات، دەبڕێت، خوێندەوە، دەڕوێنێت) هەموویان کارن.

لەم ڕستانەدا هەندێك وشەی دیکە دەمێننەوە، کە نە بکەرن‌و نە کارن، بەڵکو واتای کارەکانیان تەواوکردووەو ئەرکی کارەکانیشیان کەوتووەتە سەرو پێیاندەوترێت (بەرکار)، ئەو وشانەش بە پێی ڕستەکانی سەرەوە لەم خاڵانەدا دەرکەوتوون:

١. وشەی (گۆشت) واتای (دەخوات)ی پێ تەواوکراوەو ئەرکی کارەکەشی کەوتووەتە سەر، پێیدەوترێت (بەرکار).

٢. وشەی (خشت) واتای (دەبڕێت)ی پێ تەواوکراوەو ئەرکی کارەکەشی کەوتووەتە سەر، پێیدەوترێت (بەرکار).

٣. وشەی (نووسراوەکە) واتای (خوێندەوە)ی پێ تەواوکراوەو ئەرکی کارەکەشی کەوتووەتە سەر، پێیدەوترێت (بەرکار).

٤. وشەی (نێرگز) واتای (دەڕوێنێت)ی پێ تەواوکراوەو ئەرکی کارەکەشی کەوتووتە سەر، پێیدەوترێت (بەرکار).

**دەستور:**

**بەرکار: وشەیەکە، کە لەرستەدا بەشی کار تەواو دەکاتو ئەرکی کارەکەشی دەکەوێتە سەرو هەمیشە لە ڕستەیەکدا هەیە کە کارەکەی تێپەڕ بێت.**

## ڕاهێنانی (١)

بەرکار لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١. گوڵەکانم ئاودا.

٢. زەوییەکە ئاوەکە هەڵدەمژێت.

٣. کۆترەکەت فڕاند.

٤. ئەسپەکەمان بۆ نارد.

٥. خانووەکەیان بۆ ئازاد دانابوو.

٦. گورگەکەتان گرت؟

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم وشانەی خوارەوە بە (بەرکار) لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

زەوی، جل، مەڕەکە، ئێوە، خۆمان، سێو، پوش، پەپولە، شیر.

## ڕاهێنانی (٣)

ئـ - شیکردنەوە:

هەنگ شیلەی گوڵ دەمژێت.

هەنگ: ناوە، بکەرە.

شیلە: ناوە، دیارخراوە.

ی : ئامرازی دانەپاڵە.

گوڵ: ناوە، دیارخەری ناوی (شیلە)یە.

شیلەی گوڵ: گرێی ناوییە، بەرکارە.

دەمژێت: کاری ڕانەبردووە، تێپەڕە.

ێت : جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی تاك، بۆ بکەر دەگەڕێتەوە.

ب- ئەم ڕستانە شلۆڤەبکە:

١. ئاسک گیا دەخوات.

٢. شێرەکەمان لە دارستانەکە بینی.

# بەشی ئەدەب

١. موفتی پێنجوینی
٢. مارف بەرزنجی
٣. قەدری جان
٤. بێکەس
٥. ئەمین زەکی بەگ
٦. ئەسیری
٧. دڵدار
٨. ساڵح یوسفی
٩. دکتور کامیران بەدرخان
١٠. کاردۆخی
١١. سادق بەهائەدین
١٢. سوارەی ئێلخانی زادە
١٣. ئەحمەد دڵزار

# موفتی پێنجوینی
## ١٨٨١-١٩٥٢ز



ناوی مەلا (عەبدوڵڵا کەریم)ە، لە ساڵی (١٨٨١)ز لەدێی بێستانە لە ناوچەی پێنجوین لەدایکبووە، لە تەمەنی منداڵیدا چووەتە بەر خوێندنی حوجرە، لەسەرەتادا لای باوکی خوێندوویەتی، ئینجا بەدوای خوێندندا کەوتۆتە گەڕان بەناو شارەکانی کوردستاندا وەك: (پێنجوین، مەریوان، بانە، سەقز، بۆکان، مەهاباد، سەراو، سەروچاوە، بیارە).

لە کاتێکدا کە دوا قۆناغی خوێندنی لە بیارە دەبێت، بەهۆی زیرەکیو قسەڕەوانییەوە، مەلای گەورەی ئەو کاتەی بیارە ماموستا (مەلا عەبدولقادر) نازناوی موفتی پێبەخشیوە، چونکە هەر لەو کاتەدا موفتی شاری سنە ناوی (مەلا عەبدوڵڵای موفتی) بوو ئەمیش بەهەمان یادەوە ئەم نازناوەی پێ دەبەخشرێ. لە ساڵی (١٩٤٦)ز کە کۆماری کوردستان لە مەهاباد دامەزرا، هەر چەندە نەخۆش بوو، بەلام خۆشەویستی ئەم سەربەخۆییەی کۆماری کوردستان، گەیاندییە ناو جەرگەی ئەم کۆمارە، تا بە چاوی خۆی ئاواتی چەند ساڵەی ببینێت، لەوێ چەند پارچە هۆنراوەی بۆ کۆماری کوردستان نووسیوەو لە گۆڤاری (هەڵاڵە) بڵاوی کردۆتەوە. لە ڕۆژی ١٩٥٢/٦/١٥ز کۆچی

دواییکـردووەو لـە گۆڕسـتانی (حـاجی شـێخ)دا لـە پێنجـوین بـەخاك سپێردراوە. موفتی لە کاتێکدا ئەو دیمەنە جوانانـەی کوردسـتانی دیـوەو بەناو گوڵو گوڵستانەکاندا گەڕاوەو ئیلهامی شیعری پێبەخشیوە.

هۆنراوەی موفتی، زادەی بیرێکـی خۆمـاڵیو ئـێشو ئـازاری تێکـڕای نەتەوەکەی بووە. چـاوی لـە ئاسـۆی ڕزگـاری کـوردو پێشـکەوتنی بـاری ژیانو دۆخی کۆمەڵایەتی کوردستان بوو. وەکو نیشـتمانپەروەرێك بـڕوای بـە ڕاپـەرینو سـەرکەوتنی گەلەکـەی بـووە. لـە هۆنراوەکانیـدا هـانی ئیشـکردنی داوە، جوتیـارو ڕەنجبـەرانی کـوردی لاواندووەتـەوە، بـە گـژ زۆرداراندا چووە، ڕەخنەی لە دەرەبەگایەتی گرتووە. لە بواری بڕوابـوون بە سەربەستیو توانای ئافرەتو هێنانە کۆڕی ئیشکردنی سیاسیو پشت بەستن بە توانای ئـافرەت، هەمیشـە ئـافرەتی بـۆ ئیشـکردنو بـاوەڕ بـە خۆکردن هانـداوە، سەربەسـتی ئـافرەتی بـە بـەردی بناغـەی گۆڕانکـاری کۆمەڵ دانـاوە، لـە ڕووی ڕوخسـارەوە هۆنراوەکـانی سـادەو ڕەوانو بـێ گرێن، خوێندەوارو نەخوێندەوار تێیدەگەن.

لە ساڵی (١٩٥٩)ز بەشێك لە هۆنراوەکانی بەناوی (سـۆزی نیشـتمان) چـاپکراوە. لـە سـاڵی (١٩٩٠)ز سـەرجەم هۆنراوەکـانی بـەناوی (دیـوانی موفتی پێنجوینی) چاپکراوە. ئەمەش نمونەیەکە لە هۆنراوەکانی:

## گـــەورەیەك

گەورەیەك بۆ کەس نەبێ سێبەری

خۆم بۆ بگێڕم لە دەوری سەری؟

بە وشکی بۆچی ببمە مەیتەری

وەختێ دەرکەوێ هەستم لەبەری

هەر خۆی دایما هەوڵی ژیانی بێ

یاخوا ئەو گەورە بەشی نەمان بێ

گەورەیەك چاوی لە فەقیر نەبێ

دەربەست ژیانی جوانو پیر نەبێ

مێمل بە ماڵو دوژمن بە جان بێ

یاخوا ئەو گەورە بەشی نەمان بێ

گەورەیەك ساتێ لەژێر دەستی ئەو

ئارامم نەبێ بێ خۆراكو خەو

پاسەوانی بم بە ڕۆژو بە شەو

جوێنو شەقیش بێ بەراتەکەی ئەو

ئەگەر شۆرەتی وەك سلێمان بێ

یاخوا ئەو گەورە بەشی نەمان بێ

(سێ دێر بۆ ئەزبەرکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| مەیتەر | : | ئەو کەسەی ولاخ بەخێودەکات |
| شۆرەت | : | ناوبانگ |
| مێمل | : | دوژمنی مەرگبڕی شت |
| جان | : | گیان |
| ساتێ | : | کاتێ، گاڤەکی |
| سلێمان | : | مەبەستی (سلێمان) پێغەمبەرە |
| بەراتەکەی ئەو | : | چاکەی ئەو، خەلاتا وی |
| دەربەست نەبێ | : | بە تەنگییەوە نەبێ، گوهێ خۆ پێنەدات |
| جوان | : | لاو، جحێل، گەنج |
| ئارامم نەبێ | : | سەبرم نەبێ، سرەوتم نەبێ |



# مارف بەرزنجی
# ١٩٢١-١٩٦٣ز

ناوی (مارف عەبدولکەریم)ە، لە بنەماڵەی شێخ حەسەنی (قەرە چێوارین)ە. لە مانگی شوباتی (١٩٢١)ز لە دێی قادرکەرەم لەدایکبووە، لە تەمەنی منداڵیدا چووەتە قوتابخانە، پۆلی چوارەمی سەرەتایی لە قادرکەرەم خوێندووە، پاشان هاتۆتە کەرکوك، خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامادەیی لە کەرکوك تەواوکردووە، لە ساڵی خوێندنی (١٩٤٤- ١٩٤٥)ز لە کۆلیجی ماف وەرگیراوەو لە ساڵی (١٩٤٨)ز تەواویکردووەو بووە بە پارێزەر.

تێکۆشەرێکی ئازاو فیداکارو لەخۆبردوو بوو، لە زۆربەی ڕاپەڕین‌و خۆپیشدانەکانی ساڵانی (١٩٤٨- ١٩٥٢- ١٩٥٦)ز بەشداریکردووە. لە ماوەی ژیانیدا دووچاری دەربەدەری‌و گرتن بووە.

لەدوای شۆڕشی چواردەی تەمووزی (١٩٥٨)ز بە سکرتێری ئاشتیخوازانی شاری کەرکوك هەڵبژێردراوە. لەسەر داخوازی جەماوەر بە سەرۆکی شارەوانی شاری کەرکوك دامەزرێنرا، پاش مانگ‌و نیوێك بەهۆی ئاژاوەو هەراکەی کەرکوکەوە لە ساڵی (١٩٥٩)ز کە لە ڕۆژی ئاهەنگی یادی یەکەمی شۆڕشی چواردەی تەموزەوە ڕوویدا، گیراو درا بە

دادگـای عـورفیو بڕیـاری لەسـێدارەدانی بـۆ دەرچـوو. دوای کۆدەتـای هەشتی شوباتی(١٩٦٣)ز، لە ڕۆژی ١٩٦٣/٦/٢٣ز لە سـێدارەدراو گیـانی بەخاك سپارد.

**بەرهەمە ئەدەبییەکانی شێخ مارفی شاعیرو نووسـەرو ڕۆژنامـەنووس بریتین لەمانە:**

١. **هۆنراوە:** وەك شاعیرێکی ناسراو لە سـەردەمی دەرچـوونی گۆڤـاری (هیـوا، شـەفەق، ڕوونـاهی)و دواتـریش ڕۆژنامـەی (ئـازادی) دەرکەوتووەو هۆنراوەکانی بڵاوکردووتەوە.

٢. **وتار:** دوو جۆرە وتاری نووسیوە:

ئـ- وتار لەسەر ئاشتیو دیموکراسی.

ب- وتاری ڕەخنەییو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی: ڕەخنـەگرێکی هەڵکـەوتوو بوو، کۆمەڵێك وتاری ڕەخنـەیی و لێکۆلینـەوەی ئـەدەبی نووسـیوەو لـە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردییەکان بڵاویکردووتەوە.

٣. **چـیرۆك:** چیرۆکنووسـێکی بـە توانـابووە، چـەند کورتـە چـیرۆکی نووسـیوە، وەك: (ئـاوازو کـەباب، گـای پـیرۆز، شـەتڵ، جـەژنێکی شادی، نامەی سەرسنور، سەر لەبەیانی نەورۆزێك).

شێخ مارف ڕوناکبیرێکی چالاکی سەردەمەکەی بوو، زمانی عـەرەبیو تورکیو ئینگلیزی زانیوە، گەلێك بابەتی ئەدەبیو کۆمەلایەتیو سیاسـی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

لــه مەیـدانی ڕۆژنامەگەریـدا وەك ڕۆژنامەنووسـێکی شـارەزا ئەنـدامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری شەفەق بوو.

شـــێخ مـــارف بەرهەمـــەکانی بـــەناوی (پشـــکۆ) یـــان (شـــوان) بڵاوکردووەتەوە.

لـــه ســـاڵی (١٩٩٣)ز بەرهەمـــەکانی کۆکراونەتـــەوەو لـــه کتێبێکـــدا چاپکراون بەناوی (سەرجەمی بەرهەمەکانی مارف بەرزنجیی شەهید)

# ئەلفو یێ

لە ئەلفەوە تا یێ، هەموو شتێکی لێپێك دێ، نامانەوێ هەر بە وتن بێ بەڵکو کردارمان ئەوێ، لەم دەرگایەوە لە گێروگرفتی گوزەرانی ژیانمان دەدوێین:

**ئا- ئاو**: کەمایەی ژیانە گەلێ جار ئەبێ بەهۆی زیان، وەك لافاو، ئەڵێن دەریای دەستکردمان بۆ دروست ئەکەن، یەك لە دەربەندیخان، ئەوی تری لە دوکان. وڵاتەکەمان ئەمەی کەم بوو بۆ سەیرانو ڕابواردن، بەڵام بەراوە خواکردەکانی شارەزوورو بتوێنو ڕانیەمان ڕۆ. دیارە بوون بێ چوون نابێ. کە دەریامان بوێ ئەبێ بەراومان بچێ. جا بڕوانە ئاوی چاوی خاوەن بەراوەکان کە ڕوویان ئەکا بە بەراو، داخەکەم ئاوەکە سوێرە، ئەترسم شەکری کارخانە دەس پێ نەکراوەکەی شارەزووریش بەر ئاو بکەوێ.

**ئاگر**: کە ئاومان وت ئەبێ ئاگریش بڵێین، یادی بەخێر ئاگری خەڵوزو گڕی داربەڕوو بەهەرزانو بە ئاسان دەستمان ئەکەوێ، بەڵام ئێستا عەلادینمان لێ بووە بە چرای عەلادین، ڕووی بەفر سپی بێ ئەگینا چەقەی ددان وەك تەقەی دەنووکی لەقلەقی بەهار وا ئەبوو. وابزانم بەفر هەر بەشی کوردستانی ئێرانمان ئەکا. وەك بوویێ بە کفنی کەسو کارە لەناو چووەکانمان بەدەس بوومەلەرزەو سەرماوە.

**ئاسایش**: که ئاوو ئاگر هەبوو پێویستی ئاسایشین، بێ ئەم، ئاگر ئەبێ بە ئاگری ژیان، ئاویش بەروبوومی ڕەنجو کرداری هەمووان ئەبا. لە خۆرهەڵاتەوە تا خۆر ئاوا ئەڵێن ئاسایش.

کوردیش ئەڵێ: (شەڕ مەکەنو بێ داواش دامەنیشن).

**ب- بێ:** ئەگەر بۆم بێ، یا بۆم بهاتایە وانە ئەبووم، زۆر کەس وا ئەڵێ، بابا گوڕ گوڕ یاخوا هەر گڕ بێو گوڕەی بێ، نەوتەکەی خوێنی گەشی ژیانمانە بینایی چاومانە، بێ ئەو دنیامان تاریکو ماڵمان وێرانە.

**برادەر**: زۆرترین برادەری ئەمڕۆ هەر زمانییە، تا لەڕووبن برادەرن، پاشملەی یەکتری شتی ترن، یا هەر برادەری پۆکەرن، خۆزگە بێ درۆو دوو ڕوویی، لەسەر بناغەیەکی ڕاستیو پاك برادەرایەتیمان پێك ئەهێنا، ئەوسا ئەماندی برادەر لە برا باشترە.

**ت-ترس:** خەریك بووم بنووسم ترس باش نییە، بەلام چاك بوو زوو دەستم گرتەوەو بیرمکەوتەوە، کە دەردی ئێمە نەترسانە ترسان نییە.

خوانە خواستە ناڵێم نەترسانەکەمان لەسەرچاوەیەکی ئازایەتییەوە هاتووە، بەڵکو نەترسانەکەمان منالانەیە، گەلێ جار ئەگاتە ڕادەیەك لەوانەیە ناوونیشانو شوێنو شێوەمان لەناو بچێتو بسڕێتەوەو گەلێکمان لەبەر پێنەزانین پێچاکە. بۆیە ئەمەوێت بڵێم: برا گەل بترسن، ترسان زۆر کەڵکی هەیە. ئەگەر ترس نەبێ قوتابی کۆشش ناکاو لە تاقیکردنەوەدا سەرناکەوێ، هەروەها لە ترسی برسێتی نەبێ کەس فرمان ناکا، میللەتێکیش لە نەمانو لەناوچوونی خۆی نەترسێ، ناکەوێتە هەوڵی خۆپاراستنو بەهێزبوونو پێشکەوتن، لە هەموو کەس زۆرتر کورد

ئەبێ بترسێ، پێویستە لە هەموو خشەیەك ڕاچڵەكێت، چونكە ماران گازە.

**ح- حكوومەت:** وەكو (ژان ژاك ڕۆسۆ) ئەڵێ: ئەو دەسگایەیە كە دەڵێن لە سەرەتادا خەڵك بە ئارەزووی خۆیان بۆ پارێزگاریكردنی ژیانو ماڵو سەربەستییان دایان مەزراندووە، كەچی لە پاشاندا ئەو بە ئارەزووی خۆی لە گەلێ شوێندا خەڵك لێ ئەخورێ. لە ڕاستیدا ئەبێ هەموو ئامانجو تێكۆشانی حكوومەت بۆ كامەرانیو خۆش گوزەرانیی خەڵك بێو بەیەك چاو سەیری هەمووان بكا. كە ئەو ئامانجەی لەبیر كردوو بوو بە بەردی سەر ڕێگای پێشكەوتنی خەڵكو دركو ئازار بۆ ژیانیان، وەیا چینێك بۆ چینێ چەوسانەوە، ئەوسا شایانی ئەوەیە ئەو دەسەڵاتەی لێ بستێنرێتەوەو بدرێ بە دەستەیەكی ڕاستو دڵسۆزتر بۆ خەڵك.

**د- دەردو دەرمانو دەستی بێگانە:** خەواڵووی وامان هەن هێشتا خەو بەوەوە ئەبینن كە لەناكاوا بێگانە بێ دەردی گەورەمان تیماربكا، كورد ئەڵێ: (دەستی بێگانە هەر بۆ مار گرتن باشە). وە هەر كەسێك دەستی بۆ دەمی خۆی نەباو هەر كەسێكیش بە هیوای كاسەی ماڵ هاوسێ بێ، بەبێ شێو سەر ئەنێتەوە. كەوابوو هەر ئەبێ بە هیوای دەستی خۆمان بین بۆ تیماری برینەكانمان، بەڵام كوا ئەو دەستە دڵسۆزە بەهێزە نە لەرزۆكە تا لە دەستە گۆجو لەرزۆكو چەپەڵەكان ڕزگارمان كا؟

**ڕ- ڕێگا:** هەموو شتێك ڕێگای هەیە، كەون، ئاسمان، ژیان، زانست، سیاسەت، جەنگ، ئاشتی، ڕۆژنامەچێتی، ڕزگاری، ئەمانە هەموو لەسەر

دەستووری تایبەتی بەندەو بۆ دۆزینەوەو لێگەیشتن‌و پێگەیشتنی ڕێگای تایبەتیی خۆی هەیە.

ئادەمیزاد بەپێی پێویستی‌و داماوی خۆی لەگەڵ شوێن‌و کات‌و پلەی پێشکەوتنیا ئەم ڕێگایانە یەك لەدوای یەك ئەدۆزێتەوە بۆ کامەرانی خۆی، بەڵام ئەو ڕێگایەی ئادەمیزاد بڕیویەتی لە پێناوی ڕێگا دۆزینەوەدا زۆر دوورو سەختە، بەناو لافاوی خوێن‌و عارەقا، بەسەر بەر دەبازی ملیۆنەها کەللەی مرۆڤی لە پێناو چوودا، گەیشتۆتە ئەمڕۆمان. بۆ دۆزینەوەی ڕێگا، ڕێگای هەر شتێك، یا بڵێین ئاشتی، یا ئازادی، یا نزیککردنەوەی هاتوچوو، پێویستی چەند مەرجێکن، ئەبێ ژیانمان گەیشتبێتە ڕادەیەك، داماوی دۆزینەوەی ئەو ڕێگەیە بین، وەك گوتوویانە داماوی‌و پێویستی دایەی دۆزینەوەن، تا زۆرترین خەڵك نەکەونە ئاخ‌و ئۆف‌و خۆزگە خواستی بۆ شتێك بیر ناکەوێتە کار بۆ دەس خستنی.

(شیخ مارف بەرزەنجی)

(تەنها بۆ خوێندنەوەو ڕاڤەکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| نامانەوێ | : | مەنەڤێت، ئەم ناخوازین |
| دەرگا | : | قاپی – دەری – دەرگەه |
| گیروگرفت | : | تەنگو چەڵەمە، دژواری |
| مایە | : | هۆکار |
| زیان | : | زەرەر |
| کەم | : | کێم |
| بەراو | : | بەرئاڤ |
| خواکرد | : | خودێ کری |
| خاوەن | : | خودان |
| سوێر | : | شۆر |
| خەڵوز | : | ڕەژوو، ڕەژی |
| دەنوك | : | نکلێ |
| بەروبووم | : | بەرهەم |
| هەموان | : | هەمیا |
| پاش ملە | : | قسەکردن بەخراپە دەربارەی یەکێك کە خۆی لەوێ نەبێ |
| خۆزگە | : | خۆزی، خۆزیا، بریا، کاشکی |
| بناغە | : | بنچینە |
| ناڵێم | : | نابێژم |

| | | |
|---|---|---|
| بسرِێتەوە | : | لابات، نەهێڵیت |
| منالّ | : | مندالّ، بچوك، بچیك، زارۆ |
| تاقیکردنەوە | : | ئەزموون |
| مارانگاز | : | مارانگەستی |
| لە بیرمە | : | تێتە بیرامن |
| دەسگا | : | ئامێر |
| ئارەزوو | : | خۆزگە |
| ناکاو | : | کوتوپڕ |
| هاوسیّ | : | دراوسیّ |
| برین- بریندار | : | زام- زامدار |
| مەرج | : | شەرت |



# قــەدری جان

## ١٩١١- ١٩٧٢ز

نــاڤێ وی (عبــدالقادر عزیــز جــان)ە ل ســالا (١٩١١)ێ ل کوردســتانا بــاکور ل گونــدێ (دێریــك) ل ڕەخ بــاژێرێ (مــاردین) ڤــە ژ دایکبوویــە. ل هــەمان گونــد دەســت ب خوانــدنێ کرییــە هــەتا گەهشــتییە قۆناغــا (خانــەی مامۆســتایان) ل بــاژێرێ (ئــەزمیر)ێ ب دومــاهی ئینایــە، دناڤبــەرا ئەســکەندەرونەو ئەنتاکییــدا بوویــە مامۆســتا. ل ســالا (١٩٣١)ز ژبــەر ڕەوشــا سیاســی چــوویە جزیــرێ، چــەندەك ژ ژیانــا خــۆ ل وێــرێ بــرە ســەر، پاشــی چــوویە دیمەشــقێ‌و ئــامودەو قامیشــلۆ، ل قامیشــلۆ بوویــە مامۆســتاو پاشــی هاتییــە ڤەگوهاســتن بــۆ وەزارەتــا پــەروەردێ ل دیمەشــقێ وەکــو فەرمانبــەر، ل دومــاهیێ بوویــە سەرپەرشــت. هــەر دڤــێ قۆناغێــدا دگــەل نڤیســەرو ڕۆژنامەنڤیســێن ناڤــدار (د. کــامیران بــەدرخان‌و نــورەدین زازاو جگــەر خــوێن‌و ئۆســمــان ســەبری) کەفتییــە کــاری‌و دەســت ب بــەلاڤکرنا گۆڤــارا (هــاوار) کرییــە. د ســالا (١٩٣٦)ز هۆزانڤــان قــەدری جــان ئێکــەمین هەلبەســتا سەربەســتی نڤیســییە و بەلاڤکرییــە، بڤــی چــەندێ دبیتــە سەرکێشــێ کــاروانێ هەلبەســتا هەڤچــەرخا کــوردی، ئێــك بوویــە ژ وان هۆزانڤــانێن هــەردەم نــویکرن د تــۆرێ کوردیــدا کرییــە. ل

سالا(١٩٥٥)ز دەست ژ كارێ وەزارەتا پەروەردێ بەردایە، ژیانا وی پڕ نەخۆشی بوویەو چەندین جارا كەفتییە زیندانا. ل سالا (١٩٥٧)ز دگەل شاندێ لاوێن كورد ژ سوریێ چوویە موسكۆ ژ بۆ پشكداریكرنێ د ڤیستەڤالا شەشێ یا لاوێن جیهانیدا، بارزانیێ نەمر ژی دیت.

جارەكا دی ڤەگەڕیا سەركارێ میری و ل سالا(١٩٧١)ز هاتە خانەنشینكرن. ل ڕۆژا ١٩٧٢/٨/٩ز د ژیێ (٦١) سالییێدا كۆچی دواییدەكاتو ل گوڕستانا (خالد نەقشبەندی) ل دیمەشقێ دهێتە ڤەشارتن.

(قەدری جان) دوو سروود ب بارزانیێ نەمر گۆتینە ل ژێر ناڤێ (سەردارێ كوردان بارزانی)و (شێرێ وەلات... بارزانی هات).

(قەدری جان) د زۆر گۆڤارو ڕۆژنامەدا هەڵبەست بەلاڤكرینەو پشكداری د دانانا چەندین پەڕتوكێن فێرگەهادا كرییەو زۆر هۆزانێن چاپ نەكری هەنە، شارەزایی د زمانێ توركیو عەرەبیو فرەنسیدا هەبوو، زێدەباری زمانێ كوردی ب هەردوو زاراڤێن (كرمانجی سەروو)و(كرمانجی خواروو).

## بەرهەمێن قەدری جان:

١. داستانەك ب هۆزان

٢. ئەلفوبێیا كوردی

٣. دیوانا هەلبەستا(١٩٥٧)

٤. رۆمانا (شڤانێ كورد) یا عەرەبێ شەمۆ ژ فرەنسی وەرگێرایە سەر زمانێ كوردی، سالا(١٩٤٧)ژ ب پیتێن لاتینی ل بەیروتێ چاپكرییە.

## ڕاڤەكردنی پەیڤەكان

| پەیڤ | | واتاكەی |
|---|---|---|
| ب رەخ باژێرێ (ماردین)ڤە | : | لە نزیك شاری (ماردین)ەوە |
| ب دوماهی ئینایە | : | تەواو كردووە، كۆتایی پێهێناوە |
| د ناڤبەر | : | لەنێوان، لە مابەینی |
| ژ بەر رەوشا سیاسی | : | لەبەر بارودۆخی ڕامیاری یان سیاسی |
| هاتییە ڤەگوهاستن | : | گواسترایەوە، گوێزراوەتەوە |
| ب ڤی چەندی | : | بەم ڕەنگە، بەم شێوەیە |
| هەلبەستا هەڤچەرخا كوردی: | | هەڵبەستی هاوچەرخی كوردی |
| هەردەم نویكرن دتۆری كوردیدا كرد | : | هەمیشە نوێكردنەوەی لە ئەدەبیاتی كوردیدا دەكرد. |
| شاندێ لاوێن كورد | : | وەفدی لاوانی كورد |

## بەگێ ئاخر زەمان

(قەدرى جان)

دۆستێ من
دوژمنێ پۆستی من
بەگێ ئاخر زەمان
ئەڤ زەمبیلا تە پێ هات
نەمە داتێ ژ ئاسمان
بەنێ وێ ڕزییا
لە ناڤا ڕێ قەتییا
ئو... کەت
کەتە ناڤ دەریا سۆر
دەریا سۆر ژێڕا بوو گۆڕ
دەریا سۆر ژ فیرعەونو
چەند خودێ بچوکڕا بووکەفەن.

** ** **

مووساو موریدێن وی
هەمی
بێ پرو بێ گەمی
ژ وێ دەریایێ دەرباز بوون
ژ جەورو جەفایێ خەلاس بوون
مووسا ل سەر ڕەقسی
فیرعەون ل ور فەتسی
نەمروودێ بچوك
مە ب ئاگر دترسینە

پڤ مەشکا ڤالا
ئەی کەڤنارەیێ سالا
باوەڕیا دلێ مە
تاقەتا ملێ مە
ژ ئیمانا ئیبراهیم
پێترە، نەکێم ترە
ڤیا بزان
ئەی پێغمبەرێ دزان
دۆستێ من
دوژمنێ پۆستێ من
بەگێ ئاخر زەمان
ئەڤ زەمبیلا تە پێ هات
نەمەداتێ ژ ئاسمان
** ** **
مەزناتی
نە ب پارەو مالە
نە ب گۆڕینا کالە
مەزناتی
ب جەوهەرێ ئینسانە
ب عیلمو عیرفانە
بەلێ... ئەم خەزانی مالن

لێ زەنگینێ کەمالن

زەنگینێ ئیدیالین

دۆستێ من

دوژمنێ پۆستێ من

بەگێ ئاخر زەمان

ئەڤ  زەمبیلا تە پێ هات

نەمەداتێ ژ ئاسمان

**     **     **

کۆشکا تەیە هیم ڤالا

یا ب نینۆکا پالا

ئین ب خوون

ئین برین

گەلەك ڕەبەن ژ برچیتیا کوشت

تە ئاڤا کر دبندا ڕوونشت

ئەوێ ل سەر سەری تە هەلوەشە

گەر چی دلێ مە ب تە نائێشە

لێ ئەم دخازن

ب دل دبازن

زارۆیێن تە ئێ بێ گونەهـ

کو ب هێژمار هەنە نەهـ دەهـ

ژ وی تالووکێ خەلاس بکەن

ب رێیا ڕاست دا دەرباس بکەن

رێیا ڕاست، ڕێیامە

ئەوە باوەریا مە

زنجیر شکاندن

ئارمانج گهاندن

★★ ★★ ★★

با بلیسکا بیستان

دیرۆکا ڕاستان

دبێژە

ببێژە

گوهـ مەدە ئەفسانەیێ دێوان

ب شۆندا نەمینە ژ کاروان

کاروانێ مەدەنیەت

گروهێ بەشەرییەت

خولاسە

پێشیێو پاشیا فەلسەفە

فەلسەفە یامە

ئەڤە

دین، مەزهەب ئیمان

ببە ئینسان ببە ئینسان

★★ ★★ ★★

(کۆپلەی یەکەم بۆئەزبەرکردنە)

# ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| پۆست | : | پێست |
| ئەڤ | : | ئەو |
| زەمبیل | : | زەمبیلە، سەبەتە |
| تەپیێ هات | : | تۆپێی هاتیت |
| نەمەداتێ | : | ئیتر دانابێ، ڤێجا نادادی، ئیتر نایەتە خوارەوە |
| ژ | : | لە |
| بەنێ وی | : | بەنی ئەو |
| ل ناڤارێ | : | لەناوڕێدا |
| قەتیا | : | پچڕا |
| ناڤ | : | ناو |
| ژێرا | : | بۆ ئەو |
| خودێ | : | خودا |
| موریدێن وی | : | موریدانی ئەو |
| پر | : | پرد |
| گەمی | : | بەلەم، کەشتی |
| ژ وی | : | بۆ ئەو |
| دەرباسبوون | : | ڕزگاربوون، ڕابوردن |
| لوڕ | : | لەوێ |
| فەتسی | : | تۆپی |

ڕەقسی : هەڵپەڕی، سەمایکرد

مەشکا ڤالا : مەشکەی بەتاڵ

کەڤنارە : کۆتەردار، پیرەدار

پێترە : زیاترە

نە کێم ترە : کەمتر نییە

ڤیا بزان : ئەوە بزانە

مەزناتی : گەورەیی

گۆرین : گۆرانی

گۆڕێن : قەبرانی، کۆی (گۆر) بە مانای (قەبر) دێ

کال : باپیر

خەزان : هەژار، بەڵام لە کرمانجی خوارووا واتای پاییزە

لێ : بەڵام

ئیدیال : بیر، هزر

هیم : بناغە

ڤالا : بەتاڵ

پالا : کرێکار

ئین : ئەوانە

ڕەبەن : هەژار، بەسەزمان

برچێتی : برسێتی

ئاڤاکر : ئاوەدانکردەوە

دبندا : لە بنیدا، لەژێریدا

| | | |
|---|---|---|
| ڕونشت | : | دانیشتی |
| ئەوی | : | ئەو |
| دخازن | : | مەدڤێت، دەمانەوێت |
| دبازن | : | ئارەزوومانە |
| زارۆیێن تە | : | بچوکێن تە، مندالآنی تۆ |
| زارۆ | : | مندالّ |
| تالووکێ | : | تالووکە، مەترسی |
| ئارمانج | : | ئامانج |
| بابلیسك | : | سەدە |
| بابلیسکا بیستان | : | سەدەی بیستەم |
| دیرۆك | : | مێژوو، ڕابردووو |
| بە شۆندانەمینە | : | دوامەکەوە |
| گروهـ | : | بار، کاودان، بارودۆخ |
| دۆز | : | کێشە |

**ژێــدەر:**

١. هەفتەنامەی پەیمان ژمارە (١٥٤).

٢. کتێبی زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی دووەمی بنەڕەتی چاپی سێزدەهەم ساڵی ١٩٩٦.



# بـێکـەس
## ١٩٠٥-١٩٤٨ز

ژیـــانی پـــڕ لەدەردەســـەری‌و کـــوڵ‌و کۆڤان‌و مشەختی‌و دەربـەدەری بـووە، بـە هۆی ئـەوە(فـایق عەبـدوڵڵا بـەگ) نازنـاوی (بێکەس)ی بـۆ خـۆی هەڵبـژاردووەو لـەناو خەڵك هەر بەو ناوە ناسراوە. (فایق) لە ساڵی ١٩٠٥ز لە گوندی (سیتەك) کە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی سولەیمانی لەدایك بـووە لـە منداڵییـەوە لـە حـوجرەی فـەقێیان خوێندوویـەتی. مـاوەی چـەند سـاڵێك لـە بەغـدا ژیاوە، پاشان باوکی ڕوو لـە تورکیـا دەکـات، دایکیشـی دوای ئـەوە هـەر لەبەغـدا کۆچـیدوایی دەکـات، بۆیـە فـایق لـە سـاڵی (١٩١٨)ز دێتـەوە سولەیمانی لای مامی‌و لەوێ دەچێتە بەر خوێنـدن. دووبـارە لـە(١٩٢٤)ز دەچـێتەوە بەغـداو دوای یـەك دوو سـاڵ دەگەڕێتـەوە. ماوەیـەك لـە (ئەشـــغال) کاردەکـــات، ئینجـــا دەبێتـــە مامۆســـتا لـــە قوتابخانـــە سەرەتاییەکان.

بێکەس شاعیرێکی کوردپەروەرو وڵاتـپارێز بـووە، چـەند جـار لەبـەر بزاڤی ڕامیاری تووشی گرتن‌و لە کار دەرکردن بـووە، چـاو نـەترس‌و ئـازا بووە، بەشداری لە ڕاپەرینەکەی (٦)ی ئەیلولی(١٩٣٠)ز بەر دەرکی سـەرا لە سولەیمانی کردووەو تیایدا بریندار بوو، هیچ کاتێك گوێی بە پلەو پایەو پارەو پـوول نـەداوە، نزیـك بـووە لـە بزاڤـە ڕامیارەکـانی ئـەو کاتـە وەك

بزاقـی (ژ.ك)[1] پاشـان (پـارتی دیمـوكراتی كوردسـتان). شـیعرەكانی بـۆ خزمـــەتكردنی گـــەل‌و نیشـــتمانەكەی تـــەرخانكردووە، بەشـــی زۆری هۆنراوەكانی باس لە كوردایەتی‌و نیشتمانپەروەری دەكەن، بێجگـە لـەوە بابەتەكانی كۆمەڵایەتی پانتاییێكی فراوان داگیردەكەن.

لە دیوانەكەی كۆمەڵە سرودێكی زۆر خۆشی بـۆ منـداڵان دانـاوە، كـە سـەردەمانێكی دوورو درێـژ قوتابییـانی سـەرەتایی بـە ئـاوازی خۆشـەوە هەموو بەیانییەك لە قوتابخانەكانیان دەیانگوت لەوانە:

**١. خوایە وەتەن ئاواكەی        ٢. شاخی ڕەنگاو ڕەنگی گۆیژە**

**٣. ئەی دلێران بێچووە شێران‌و... گەلێكی تر**

لە ڕۆژی ١٩٤٨/١٢/١٨ز لە هەڵەبجە كۆچی دواییكـردو لـە گۆرسـتانی گردی سەیوان لە سولەیمانی بە خاك سپێرراوە.

لــە ڕۆژی ١٩ی حــوزەیرانی ١٩٤٧ز كاربەدەســتان‌و دەســەڵاتدارانی حكومەتی عیراق چوار ئەفسەری كوردپەروەریان لـە سـێدارەدا، ئەوانـەی بەشـداریان لـە دامەزرانـدنی كۆمـاری مـەهاباد كردبـوو، چـوار ئەفسـەرە شەهیدە جوانە مەرگەكە ئەمانە بوون:

(عیزەت عەبدولعەزیز)، (محەمەد مەحمود قودسی)

(مستەفا خۆشناو)، (خەیروڵلا عەبدولكەریم)

بێكەس ئەم پارچە هۆنراوە بە سۆزەی لە پێشـوازی ئـەو شـەهیدانە گوتووە، كە تەرمی دووانیان لە بەغداوە بۆ سولەیمانی براوە.

---

[1] – (ژ.ك) كۆمەڵەی ژیانەوەی كوردستان

قەومی کورد ئیسپاتی کرد بۆ عالەمی سەر ڕووی زەمین

میللەتێکی قارەمانن هەر ئەبێ سەربەست بژین

میللەتێ لاوی لە ڕێگەی سەربەخۆیی نیشتمان

بێتە بەر سێدارە، بێ ترس، دەم بەخەندەو پێکەنین

قەومی وا نامرێ، ئەژی، با دوژمنی هەر شەق بەرێ

ساحیبی ڕۆڵەی نەبەردە، خاوەنی عەزمی مەتین

ئەو کەسەی گیانی لە ڕێگەی نیشتمانا بەخت ئەکا

پێی ئەڵێن مردوو، شەهیدە، وا لە فیردەوسی بەرین

لاوی کورد مەردە، لە مردن قەتعییەن باکی نییە

پەندی پێشینانە، ڕاستە (بەرخی نێر بۆ سەربڕین)

وا وەتەن دیسان بە مەحزوونی ئەڵێ: ئەی لاوەکان

بۆچی وا ماتو مەلوولن، بەسیەتی شینو گرین!

ڕۆژی تێکۆشانە، سادەی هیممەتێ تاکو زووە

بەشکو لەم حالە نەجاتمان بێو لە دیلی دەربچین!

گەرچی هەندێ کەس خەریکن ورگو گیرفان پڕ ئەکەن

شەو بەبێ خەم سەر ئەنێنە سەر سەرین، هەر سەرسەرین

پیاو ئەبێ دائیم خەمی قەومو وڵاتی خۆی هەبێ

ئەو کەسانەی بێ خەمن حاشا نەوەی ئەم خاکەنین

** ** **

(سێ دێر بۆ ئەزبەرکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| مشەخەتی | : | ئاوارە |
| ساحیبی ڕۆلەی نەبەردە | : | خودانی ڕۆڵەی ئازایە |
| بەخت ئەکا | : | فیدادەکات، دەبەخشێت |
| ماتو مەلوولن | : | بێدەنگو خەفەتبارن |
| سەر ئەنێتە سەرسەرین | : | سەر ئەخەنە سەر بالیف |
| هەر سەرسەرین | : | هەر هیچو پوچو بەدڕەوشتن |
| سەرەتایی | : | بنەڕەتی |



# ئەمین زەکی بەگ

## ١٨٨٠-١٩٤٨ز

مێـژوونووس و ڕونـاکبیرو ئـەدیب و گـەورە پیـاوی کـورد نـاوی (محەمـەد ئـەمین زەکـی عەبــدولڕەحمان مــەحمود)ە، لــە ســالّی( ١٨٨٠)ز لە شاری سولەیمانی لەدایکبووە، لە سـالّی(١٨٩٢)ز چـووەتە قوتابخانـەی سـەرەتایی و ئینجـا دوای سـالّێك چووەتە پۆلی دووەمی قوتابخانەی ئامادەیی عەسکەری لە بەغدا، پاشان خوێنـدنی عەسـکەری لـە ئەسـتەمبۆلّی پایتـەختی دەولّـەتی عوسمـانی تەواودەکات و لە لەشکری شەشەم لە سالّی(١٩٠٢)ز دەبێتە ئەفسەر، لـە سـوپای عوسمانیـدا گـەلێك پایـەو پلـەی جۆراوجـۆری پێسـپێراوە، لـە جـەنگی گـەورەی یەکـەم لەبـەرەکانی جـەنگ لـە عـیراق و فەلەسـتین و قەفقاسیا، لـە کۆمەلّـەی دەسـت نیشـانکردنی سـنوور لـەنێوان دەولّـەتی عوسمانی لەگەلّ هەر یەك لە ڕوسیاو بولگاریا ئەندام بووە.

لە (١٩٢٤)ز هاتووەتـەوە عـیراق و بـووە بـە مامۆسـتای قوتابخانـەی عەسکەری، چەند جارێك پۆستی وەزارەتە جۆراوجۆرەکانی پێسـپێراوە، هەروەها لە پەرلەمانی عێراقدا بووەتـە نوێنـەری شـاری سـولەیمانی، لـە سـالّی (١٩٤٢)ز دەسـتی لـە وەزارەت کێشـاوەتەوە، تـا تەمـەنی (٦٨) سـالّیدا بــە ئەندامییــەتی ئەنجومــەنی پــیران ماوەتــەوە، لــە (١٠)ی

تەمووزی(١٩٤٨)ز کۆچی دواییکردووەو لە شاری سولەیمانی گردی سەیوان نێژراوە.

ئەمین زەکی بەگ هەر لە منداڵییەوە خولیای مێژوو و شوێنەواری کۆن بووە، بەهرەیەکی زۆری لە زانستەکانی عەرەبی، تورکی و فارسی وەرگرتبوو، شارەزایەکی زۆری لە زمانەکانی ئینگلیزیو فەرەنسی هەبوو، دەیان پەڕتوکی بەزمانی تورکی لە بارەی کاروباری سەربازییەوە داناوە. بە زمانی کوردیش کۆمەڵێك پەرتوکی مێژووی داناوە، وەك:

١. خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان

٢. ناودارانی کورد (مشاهیر الکرد) بە زمانی کوردی لە دوو بەرگدا دایناوە.

٣. تاریخی لیوای سولەیمانی بە کوردی لە(١٩٣٧)ز لە بەغدا چاپکراوە.

ئەمەش نمونەیەکە لە نووسینەکانی:

## ( زمانی کوردی )

نەك زۆری خەڵك بەڵکو بەشی زۆری عولەماو موتەفەکریش لە خوسوسی کونهو ماهیەتی زمانی کوردییەوە یان بە تەواوی بێ خەبەرن وەیان زۆر خراپ تێگەیشتوون. کە لەبابەت ئەم زمانەوە پرسیاریان لێ ئەکەی ئەڵێن: ئەم زمانی کوردییە لەهجەیەکی تێکەڵو پێکەڵی فارسییەو ئەسڵو ئەساسێکی سەربەخۆو ڕێكو پێکی نییە !. زاهر وایە سەبەبی جێگیربوونی مشابەهەت لە بەینی بەعزێ کەلماتو ئەلفازی کوردیو

فارسیدا، وه دووه‌میش ئیستعمال کردنی به‌عزێ که‌لماتی فارسی له کوردیدا، ئه‌گه‌ر باش سه‌رنجی لێ بده‌ین ئه‌بینین که له‌یه‌ك چوونی هێندێ که‌لمه‌ی کوردی له فارسی نه‌تیجه‌ی خزمایه‌تییه‌کی به قووه‌تی ئه‌م دوو زمانه‌یه‌و ئه‌م نه‌وعه مشابهه‌ته له به‌ینی زمانه خزمه‌کانی تریشدا هه‌یه، ئینگلیزی‌و جه‌رمه‌نی‌و لاتینی چونکه هه‌موویان له ئه‌سلێك– زمانی ئاری قه‌دیم) هاتوونه‌ته خواره‌وه، ئه‌بینین، که زۆر له‌فزو که‌لمه‌یان له‌یه‌ك ئه‌چن‌و ئه‌م لێکچوونه هیچ ساحب مێشکێکی شاره‌زای تووشی غه‌له‌تێکی وا نه‌کردووه که بلێ ئه‌سلی ئینگلیزی جه‌رمانییه وه‌یا لاتینییه به‌لکو ئه‌لێ: سه‌به‌بی ئه‌م مشابهه‌ته ده‌لاله‌ت له‌وه ئه‌کا که هه‌موو ئه‌م زمانانه له ئه‌سلێك– که زمانی ئارییه– هاتوونه خواره‌وه‌و که‌لماتی متشابهه‌یان که‌لماتی ئه‌سلیه‌ن وه له هه‌موویانا ماوته‌وه‌و که‌مێك زۆرێك ته‌له‌فوزه‌که‌یان گۆڕاوه.

نازانم بۆچی (متفکرین) له باسی زمانی کوردی‌و فارسیدا له‌م حه‌قیقه‌ته لائه‌ده‌ن‌و کوردییه‌که‌مان ئه‌که‌نه بێچوویه‌کی له‌ڕو لاوازی زمانی فارسی؟!.

ئه‌گه‌ر به ئینساف لێکی بده‌ینه‌وه ئه‌بینین که به‌شی زۆر زۆر که‌لماتی کوردی له شکل‌و ته‌له‌فوزدا له فارسی ناکاو سه‌ربه‌خۆیه، (برژانگ، سك، دایك، باوك، کچ ) واقعا له به‌ینی (تووك، لووت، چه‌ناگه، کوری)ی کوردی‌و (موو– بینی) (زنخ– زنخدان)، (مژه)، (شکم)، (مادر)، (پدر)، (دختر)، (پسر)ی فارسیدا هیچ مشابهه‌تێکی له‌فزی نابینرێ، جا که‌وا بوو ئه‌م که‌لماتانه ئه‌بێ له دوای جوێ بوونه‌وه‌ی

قەومی کوردو فارس ڕەنگە ئەم حادسەیە لە عەسری نۆهەم وەیا دەهەمی پێش میلاددا واقع بووبێ– ئیجاد کرابێ، ئەو پێنج مشابهەتەی (تەلەفوزی، ئەساسی، شکلی، تەسریفیو نەحوی) کە لەبەینی کوردیو فارسیدا ئەبینرێ دەلیلی ئەوەیە کە ئەم دوو زمانە لە ئەسلێکی مەعلوم، کە لەپێش هجرەتیانا بۆ تەرەفی غەرب زمانێکی موشتەرەك بووە، هاتووتە خوارەوەو هەر وەك زمانی ئەقوامی ئاری تر بەرە بەرە فەرقێکی کەمو زۆری تێ کەوتووە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| عولەما | : | (علماء) کۆی (عالم)ە، واتە زانایان |
| متفکرین | : | خاوەن بیران، خودانێت هزرو بیرا |
| لە خوسوسی | : | لە بابەت، لەبارەی |
| ماهیەت | : | جەوهەر، بنەڕەت |
| کەلیمە | : | وشە، پەیڤ |
| ئەسلێك | : | ڕەگەز، بنچینە |
| مێشك | : | مژی |
| غەڵەت | : | هەڵە، چەوتی |
| حەقیقەت | : | ڕاستی |
| تووك | : | موو، می |
| لوت | : | کەپو، دفن |
| چەناگە | : | چەهـ ، ئەرزینگ |
| برژانگ | : | مژیلانگ |
| حادیسە | : | ڕووداو |
| عەسر | : | سەدە، بابلیسك |
| کونهو ماهیە | : | ڕەچلەك، ڕەگوریشە |

# ئەسیری

١٨٩٠-١٩٦٢ز



ناوی (عەبدولخالق حوسێن نەقشبەندی)یە، نازناوی شیعری (ئەثیری-ئەسیری)یە. لە ساڵی (١٨٩٠)ز لە شاری کەرکوك لە گەڕەکی (ئەخی حوسێن) لەدایکبووەو چاوی بە دیمەنە جوانەکانی کوردستان کراوەتەوەو لەناو گوڵزاری خوێندنو زانیاریو ئەدەبدا خونچەی ژیانی پشکووتووە، هەر لەسەرەتای منداڵییەوە بۆ خوێندن چووەتە حوجرەی مزگەوت، گەلێك شوێنی کوردستان گەڕاوە بە دوای زانستو فێربووندا، وەك (سولەیمانی، بانە، سەقز، سنە، کرمانشان، هەمەدان) لە دواییدا گەڕاوەتە شاری کەرکوك لە ماوەی خوێندنیدا فێری گەلێك جۆرە زانست بووە، وەك: (ڕێزمانی عەرەبی، ڕەوانبێژی، مەنتیق، ئوسوڵی کەلام). ئیجازەی زانستیی لە مەلا (عەلی حیکمەت سیامەنسوری) وەرگرتووە.

ئەسیری بە نیازی دیدەنی نەجمەدین ئەفەندیی برای، خۆی گەیاندۆتە ئەستەمبۆل، لەوێ چاوی بە شێخ عەبدولقادری شێخ عوبەیدوڵلای نەهری کەوتووەو جموجۆڵو چالاکییەکانی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلی کوردی دیوە، کە لەلایەن کۆمەڵێك لە ڕۆشنبیرانی خوێن گەرمی کورد لەو شارە دەکرا. ئەمە کارێکی گەورەی کردۆتە سەر ئەسیریو عەشقی نیشتمانپەروەری لە دڵیدا پەیدابووە.

بە بیستنی هەواڵی کۆچیدوایی باوکی لەگەڵ بڕانەوەی جەنگی یەکەمی جیهان لە ساڵی (١٩١٨)ز گەڕاوەتە کەرکوک بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری تەکیەو ماڵو خێزانەکەیان.

- ماوەیەك لە دادگای شەرعیەی کەرکوك بە نووسەری یەکەم دامەزراوە.
- لە ١٩٥٨/١١/١ز خانەنشینکراوە.
- لە ڕۆژی ١٩٦٢/٦/١٨ز کۆچی دواییکردووەو لە گۆرستانی شێخ محیەدین لە کەرکوك نێژراوە. ئەسیری شاعیرێکی زانستپەروەر بووە، خەڵکی هانداوە بۆ ئەوەی بچن بۆ قوتابخانەو فێری زانست ببن.

لە هۆنراوەکانیدا داوای یارمەتیو کۆمەککردنو یەکێتی ڕیزەکانی نەتەوەی کوردی کردووە، چونکە زانیویەتی کە گەل بەبێ هاوکاریو یەکێتی لە کاروانی خەباتو تێکۆشاندا بە ئامانجە ڕەواکانی ناگات.

ئەسیری وەك شۆڕە سوارێکی مەیدانی ئەدەبی نەتەوەی کورد لەنێوان ساڵەکانی (١٩٢١- ١٩٣٤)ز دلێرانە ئەسپی شیعری شۆڕشگێری تاوداوەو هۆنراوە ئاگرینەکانی، وەك مەشخەڵی گڕی ئاگری باوەگوڕگوڕ تاریکی کوردستانی ڕوناککردۆتەوە، لەبەر ئەمە بە شاعیرێکی شۆڕشگێڕی قۆناغی دوای حاجی قادری کۆیی دادەنرێت.

ئەسیری شەیدای دیمەنە جوانەکانی کوردستان بووە، وێنەو نەقش‌و نیگاری کوردستانی ڕەنگین، وەستایانە لەناو تابلۆی هۆنراوەکانیدا دەکێشێت وەك لەم هۆنراوەیەدا:

## بێرە کوردستان

بێرە کوردستان عەزیزم گەر تۆ سەیرانت دەوێ

بت بەمە قەندیل ئەگەر گوڵزاری کوێستانت دەوێ

سەیری ئەو خێڵانە، کە نیشتونە داوێنی چیا

با بچین بۆ ماڵی کوردی گەر تۆ خوێشانت دەوێ

بت بەمە پای تاقی لای سەر پیل‌و سەر میل‌و کرند

پێت نیشاندەم سەد هەزار ئاساری ساسانت دەوێ

ئاوی ساف‌و ڕۆشنی داوێنی چەشمەکانی چیا

لێی بنۆشە دەم بە دەم، گەر ئاوی حەیوانت دەوێ

لاوی کوردی من، لە بەرکە شاڵی زاخۆو ئامێدی

گەر تۆ سەد چاتر لە ڕەنگی شاڵی کرمانت دەوێ

هەڵسە گەشتی چیمەن‌و گوڵزاری کوردستان بکە

گەر لە بۆ دەردی دەروونت داو و دەرمانت دەوێ

ڕوح‌و ماڵت سەرفی ڕێگەی میللەتت کە ڕوحەکەم

گەر لە خوا لوتفی عەمیم وجودو ئیحسانت دەوێ

ئەی ئەسیری هێندە عەشقی میللەتی کوردت هەیە

بشمری لام وایە قەبری گردی سەیوانت دەوێ

(سێ دێر بۆ ئەزبەرکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| مەنتیق | : | ژیربێژی، لۆژیك |
| بێرە | : | وەرە |
| سەیری ئەو خێلانەکە | : | تەماشای ئەو عەشیرەتانە بکە |
| نیشتوونە داوێنی چیا | : | لە داوێنی چیا خێوەتو ڕەشماڵیان هەڵداوە |
| خوێشانت دەوێ | : | خزمانت دەوێ |
| پای تاقی | : | ناوی جێگاییێکە |
| سەرپیلو سەرمیلو کرند | : | ناوی سێ شوێنە |
| چەشمەکان | : | سەرچاوەکان، کانییەکان |
| لێی بنۆشە | : | لێی بخۆوە، ژێ ڤەخۆ |
| ئاوی حەیوان | : | ئاوی حەیات |
| لەبەرکە | : | بپۆشە، بکەبەرخۆ |
| چاتر | : | چێتر، چاکتر، باشتر |
| گەشت | : | گەریان، سەیران |



# دڵــدار

## ١٩١٨- ١٩٤٨ز

یونســی مــەلا ڕەئــووف لــە ٢٠ی شــوباتی ســاڵی ١٩١٨ز لــە کۆیــە لــە دایك بووە، بۆ یەکـەم جـار لـە ڕانیـە دەچــێتە قوتابخانــەو لــە خوێنــدن بەردەوام دەبێت، تا لە ساڵی (١٩٤٥ )ز کۆلێـژی مـاف (حقـوق) لـە بەغدا تەواو دەکاتو دەبێتە پارێزەر.

دڵـدار هۆزانڤانــەکی نیشـتمانپەروەر بـوو، شـەیدای سروشـتی جـوانی وڵاتەکـەی بـوو، هۆنراوەکـانی (حـاجی قـادری کـۆییو نـالیو عـەونیو وەفـاییو کـوردیو بێکـەسو پیرەمێـرد) سەرچـاوەی ئیلـهامی شـیعری دڵـدارن، هــەروەها سروشــتی جــوانو ڕەنگینــی کوردســتان، هۆیــەکی سەرەکی بوو لە بەهرەی شیعری دڵدار، سەرەرای ئەمەش باری ناخۆشی ژیانی خۆیو ئەو بارودۆخەی کە گەلی کورد تیایدا دەژیـا، ئەمانـە هـەموو پێکەوە هـەوێنی شـیعری دڵـدار بـوون، ئەگـەر مـەرگ کۆتـایی بـە ژیـانی کورتی نەهێنابا بێگومان بـووین لـەوەی، کـە دڵدار دەبـووە لوتکەیـەکی بەرزی ئەدەبیاتی کوردی.

یەکەم پارچە هۆنراوەی لـە سـاڵی (١٩٣٥)ز لـە ژمـارە (٢)ی گۆڤـاری (ڕۆناکی) بڵاوکردووەتەوە.

دڵدار لە هۆنراوەکانیدا تواناو بەهرەیێکی زۆری پیشـانداوەو خـاوەنی فەلسـەفەیەکی بـەرزیش بـووە، شـەیدای بیروبـاوەری کوردایـەتی بـووە،

هۆنراوەکانی سادەو ڕەوانو پڕ سۆزن، بەشی زۆریـان بـە دەوری بابـەتی نیشتمانپەروەری‌و کۆمەڵایەتیـدا دەسـوڕێنەوە، دیـوانێکی چـاپکراوی بـە ناوی (دیوانی دڵدار)، لەگەڵ دەیان گوتاری بەنرخی ئـەدەبی، ڕامیـاری و ئـابوری لـەدوای خـۆی بـە جێهێشـتوە لـە ١٩٤٨/١١/١٢ز لـە شـاری هـەولێر ماڵئاوایی لە کوردستان کردو هەموو ئاواتەکانی بەو تەمەنە کورتـە بـردە ژێر خاک.

نمونەیەك لەهۆنراوەکانی:

**کوردستانی خۆش، نیشتمانی جوان**

**تۆ قیبلەگاهی منی بێگومان**

**چاوم پشکوتووی شاخەکانتە**

**فێری ژیانی باخەکانتە**

**دەنگی شمشاڵی شوانەکانت**

**زریق‌و باقی جوانەکانت**

**قاسپەی کەوانی قەد کێوەکانت**

**خوڕەی ئاوەکەی نشێوەکانت**

**ئەمانە هەموو گوێیان کردمەوە**

**هەوێنی شیعری دڵیان گرتمەوە**

**نەو نەمامێ بووم لەم خاکە ڕووام**

**بە خۆشەویستی وڵات ئاودرام**

**بەڵێ کوردستان تۆ منت خوڵقان**

**تۆ منت خوڵقان پێت بەخشیم ژیان**

**خۆشی ژیانم خۆشی ژینتە**

**ئێشی ژینی من ڕۆژی شینتە**

**چونکە کوردستان، نیشتمانی جوان**

**تۆ قیبلەگاهی، دڵی بێگومان.**

(سێ دێڕ بۆ ئەزبەرکردنە)

## راڤەکردنی پەیڤەکان:

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| پارێزەر | : | بەرەڤان، محامی |
| شەیدا | : | عاشق |
| هەوێن | : | هێوێن، خمیرة |
| پشکوتوون | : | کراوە، ڤەکری |
| زریقو باقی | : | دەنگی یاریکردنو گەمەکردن |
| گوێیان کردمەوە | : | گوهێن من ڤەکر |
| نەونەمام | : | نەمامی تازە، شتڵەداری تازە |
| پێت بەخشیم | : | پێتدام، تەدایە من |

# سالّح یوسفی

## ١٩١٨- ١٩٨١ز



ناوی (سالّح عەبدوللّا یوسفی)یە، یەکێك بوو لە ڕوناکبیرو تێکۆشەرانی گەلەکەمان، لە سالّی(١٩١٨)ز لە گوندی (بامەڕنێ)ی سەر بەقەزای ئامێدی لە پارێزگای دهۆك ژ دایك بوویە. خوێندنی سەرەتایی لە گوندی بامەڕنێ دواناوەندیشی لە بەغدا تەواو کردووە، لە سالّی (١٩٤٣)ز لە کۆلێژی (شەریعە) لە بەغدا دەرچووە. شاعیر دەورێکی گەورەی گێراوە لە بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلی کورد، ئەندامێکی چالاکی حیزبی (هیوا)و ئینجا (پارتی دیموکراتی کوردستان)بووە لە پاشان دەستەی دامەزراندنی(حیزبی سۆشیالیستی کوردستان) بوو، هەروەها ڕۆژنامەوانێکی لێهاتوو بووە، لە بواری ڕۆشنبیریدا خزمەتی زۆری هەیە، سەرنوسەری گۆڤاری (ئەستێرە)و (ڕۆژی کوردستان) بووە. زۆربەی هۆنراوەکانی باسی کوردایەتی دەکەن‌و بە هۆنراوەی سیاسی دادەنرێن.

هەروەها داوایکردووە، کە بیری ئازادی سەر هەلّبداتو گەشەبکات.

لە سالّی (١٩٨١)ز بە پیلانێکی ڕەش لە بەغدا شەهیدکرا.

ئەمەش نمونەیێکە لە هۆنراوەکانی:

**ڕۆژا مێرو خورتا هەلات     هاتن ژ هەوارێ تە، وەلات**

**ژیێ لاوەتی‌یە، خەلات     جانێ خۆ دکەینە قەلات**

ئەڤرۆ ڕۆژا مە مێرانە	هەولی خورتو عەگیدانە
گۆری کرن خۆش سەیرانە	د ڕێکا وەلاتیدا قوربانە
ئەم پلنگی زەند ئاسنین	شێرێت وەلاتی مەزنین
سنگ چیاینە، عەرد درنین	نەهەنگێت شەرێ بێ بنین
نەیارا هەمیا دێ سوژین	دا بسەربەستی هونەر بژین

(سێ دێر بۆ ئەزبەرکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| بزاڤ | : | بزوتنەوە |
| مێر | : | پیاو |
| ژیێ لاوەتی | : | تەمەنی لاویەتی، تەمەنی گەنجیەتی |
| جانێ خۆ | : | گیانی خۆمان |
| ئەڤرۆ | : | ئەمرۆ، ئیرۆ |
| عەگید | : | ئازاو خورت |
| گۆریکرن | : | خۆ کردنە قوربانی، خۆبەختکردن |
| دڕێکا | : | لە ڕێی، لە ڕێگای |
| نەیارا | : | نەیاران، دوژمنان. |
| هەمیا | : | هەمووان |
| دێ سوژین | : | دەسووتێنین. |

## کامیران ئەمین عالی بەدرخان

## ١٨٩٥-١٩٧٨ز



دکتۆر کامیران ئەمین عالی بەدرخان لە ساڵی (١٨٩٥)ز لە ئەستەمبۆڵ لەدایك بووە. ژ بنەماڵا بەدرخانیانە، خوێندنی لە ئەستەمبۆڵ بە دوماهی هینایە، پاش سەرکەوتنی شۆڕشی کەمالستەکانو حاشاکردنیان ژ هەموو مافێن کوردان، سەرۆکێن کوردان ژ وەلات هاتن دوور خستن، ئەمین عالی بەدرخانو کوڕێ وی (ئەحمەد ثورەیا) چوون ل میسرێ ئاکنجی بوون، کامیرانو جەلادەت ژی چوونە ئەڵمانیاو دەست ب خاندنا بلند کر ل کۆلێژا حقوقێ باوەرنامە (دکتۆرا) وەرگرت، پاشان لە زانکۆی (سۆربۆن)ی فەرنسی باوەڕنامەی بڵندی فەلسەفەو ئادابی وەرگرت. لە ئەوروپا تێکەڵی لەگەڵ زۆر لە ئەدیبو نڤیسەرێن ناڤدار پەیداکرد وەك (لوسی پۆل مارگرێت، مارگرێت ڕۆدینکۆ). گوتاری بە زمانی کوردیو زمانی تریش لە گۆڤاری (هاوارو ڕۆناهی) بلاوکردووتەوە، هەروەها هەڵبەستێن نیشتمانی لە ژێر ناوی (گەڕۆك) بلاوکردووتەوە.

لە دەستپێکی ساڵی(١٩٤٣)ز ل بەیروتێ حەفتەنامەی (ڕۆژانوو)ی وەشاندووە هەر لە(١٩٤٣)ز گۆڤاری (ستێر)ی دەرخست. لە(١٩٤٧)ز چووە فەرەنساو لەوێرێ (سازگەها لیکۆڵینێ کوردی) داناو گۆڤارەك بناڤێ (بولتەنا مەرکەزا لێکۆلینێ یا کورد) دەرخست. دوازدە ساڵان

بـەبێ پـارە خزمەتـەكا زۆری زمـانی كـوردی لـە پەیمانگـەی (زمانـە زینـدووەكان) كـردووە. خزمەتـەكا زۆری یـا زمـانو ئـەدەبو دۆزا كـورد كرییە. لە(١٩٧١)ز بووە بە ئەندامی كارای كۆری زانیاری كورد لە بەغدا. لـە سـاڵی(١٩٧٨)ز لـە پـاریس دەچـێتە بـەر دلۆڤانیـا خـودێو لەسـەر وەسیەتاویماڵەكەیو بۆ دامەزراندنی دەزگەیێكی چاندنی– زانسـتی بـە ناوی (بەدرخان– كوردستان) تەرخانكرا، پاش مردنـی كتێبخانەكـەی درا بە (ئەنیستیتۆی كوردی) لە پاریس.

دكتـۆر كـامیران بـەدرخان تێكۆشـەرێكی سیاسـیو ڕونـاكبیرێكی ژێهـاتیو مـەزن بـوو، بێجگـە لـە كـوردی، تـوركیو عـەرەبیو ئـەڵمانیو فەرەنسیو یۆنـانیو ئینگلیـزیو پۆلـۆنی دەزانـی. بەرهـەمی زۆری هەیـە لەسـەر (ڕێزمـان، چـیرۆك، پەخشـان، ئـەلفوبێ... هتـد)، هـەروەها فەرهەنگی (كوردیو فەرەنسی)، (ئەڵمانی و كوردی) داناوە.

## لاوكـێ مـن

**ڤاڤا كـۆ فـەرمانا كـوردان ڕابـوو ئـەم هێـژ نـوو زەوجـی بـوون. شـەڤەكێ تـۆ پـڕ درەنـگ مـایو ڤاڤا تـۆ هـاتی مـال، ددەستێن تـە دە تڤەنگەكە نوو و چەند سەد بەرك هەبوون. دلێ من ترسـیاو ڕەجفـی، من ژ تەرە ب دەنگەكی لەرزی دگۆت.**

**– كورگین... دیسان چ هەیە؟**

**تـەل مـن هیڤینـا چـاڤانو ب كەسـارا دلان مێزەكـر، پاشـی ب دەنگەكی خورت ل من ڤەگەڕاند.**

**– داوەت دەست پێ دكە.**

دوەلاتی دە شەش مەهـ شەڕەکی زۆر چێبو، ژن بی بوون، زارۆك سێوی مان، کورد دەسپێکێ دە دوژمن شکاند، لێ، پاشی ب بێ بەختی هاتنە شکەستن.

گاڤا تو دشەڕ دەبوویی، من ژ تەرە کوڕکەك ئانی ئێڤارکێ، ئەز لبەر دەریێ مالێ سەکنی بووم، چاڤێن من لێ ڕێ بوون. من دیت تو هاتی، هەردوو دەستێن تە بخوین بوون، دسەر سینگاتە دە برینەکە کوورو ڤەکری هەبوو، تە... ئەز همێز کرمو تەگۆت عەسکەرێن دوژمن دسەر شۆپا من دە نە، باوڕکە نهۆ ئەوێ بێنو من بگرن، مەگری!!!

تنێ ڤی دەمی ژبیرا مەکە. پاشی تو ب گاڤێن لەز چویی سەر دەرگۆشا کوڕێ خوە ئێ پێنج مەهی (تاجین)و تە ئەو هلانیو ژیرا گۆت.

- تاجین!! دلێ تە ژ بوو نا ئاریکارییا کوردستانێیە. خویناتە ژبوونا شەڕو ڕژاندنێیە. تە کوڕێ خوە دکر ناڤ دەرگۆشێو عەسکەرێن دوژمنان دکەتن هندرێ مالێ...

لاوکێ من! ئیرۆ پێنج سال قەد یاینە کۆ ئەم ژ هەڤ دوور هاتنە ئێخستن. تۆ نهۆ دکۆرتالکێ دە ب سەد جامێرێن کورد ڕا دکەڤی.

خوە دزانە... چەرمێ ڕوو وسینگاتە پرچڤیو لاشێ تەڕزییایە.

لێ، گورگین. بزانە کۆ هەر شەڤ بەری هەرە ڕاکەڤا کوڕێ تە تاجین زەندو دەستێن خوە ئێن تەڕ داڤێژە سەر ستۆیێ من و ب

چاڤێن خوه ئێ زەلوول و ب کەسەر ل من مێزە دکە، من ماچ دکە ژمن ڕە دبێژە.

- دایێ!... دایکا من باڤێ من ڕە بنڤیسینە کۆ مەزن بوومە. دلێ من ژ بۆ هەژکرنا کوردستانێیە، خورتییا ژ بوونا ئاریکارییا کوردستانێیە، خوینا من ژبۆ شەرو ڕژاندنێیە!!!

لە (د وەلاتی دە شەش مەهـ شەرەکی زۆر چێبوو) لەبەر دەکرێ تا (تەکورێ خوە دکر ناڤ دەرگۆشێو عەسکەرێن دوژمنان دکەتن هندرێ مالی)

دکتۆر. کامیران ئەمین عالی بەدرخان
گۆڤاری هاوار ژمارە (٤) ڕوو پەل٦
٣ێ تیر مەهێ- ئێك شەمب- ١٩٣٢ز

# ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| شۆپ | : | دەوس: شوێن پێ |
| همێز | : | هەمبێز: باوەشکرن، ئامێز |
| دەرگۆش | : | لاندك، لانك |
| پرچفی | : | چرمسی، سیس بوو |
| کەتن هندرێ مالێ | : | هاتنە ژوورڤە |
| هندر: داخل: | : | هندور: هوندور |
| ژن بی بوون | : | بێوەژن |
| مەگری | : | نەکە گری |
| کۆرتالك | : | کەند |
| هلانی | : | ڕاکر، بەرزی کردەوە، هەڵگرت |
| ئاریکاری | : | هاریکاری |
| قەدیاینە | : | بۆرینە/ تێپەڕینە |
| بولتەنەك | : | گۆڤارەك وەرزیی |
| مێزەدکە | : | دنێڕیت، سەیری دەکات |
| زەلوول | : | خاشع چاودا گرتوو |
| داڤێژە | : | ئاڤێتە ، دهاڤێتە |
| خورتی | : | گەنجی، لاوێتی |
| باڤ | : | باب، باوك |
| هەژکرن | : | حەژێ کرن، حەز لێکرن |

# کاردۆخی

## ١٩١٦- ١٩٨٢ز



ناوی (محەمەد ئەمین کاکە شێخی تەوێڵەیی)یە کە هەر لە تەوێڵەی هەورامان لە ساڵی (١٩١٦)ز لەدایکبووە. سەرەتا خوێندنی لەلای باوکی دەست پێکردووەو ئینجا چووەتە قوتابخانە، بەردەوام بووە لەسەر خوێندن تا لە ساڵی (١٩٣٩)ز بووە بە مامۆستای سەرەتایی.

کاردۆخی، هەر لە خۆیدا خاوەنی بەهرەو توانایێکی باش بووە، بۆ ڤەهاندنو هۆنینەوەی شیعر، بەڵام شاعیر، وەك هۆزانڤانەکانی دی کەوتووتە بەر کاریگەرییەتی چەند هۆیەك، کە ئەو بەهرەو توانایەیان بەهێزترو پتەوتر کردووە، جگە لەوەش، خۆشەویستیو ئەڤینی، سەرچاوەو ژێدەرێکی تری هەڵقوڵینی کانیاوی هەڵبەستی بووە، سەرەڕای ئەمانە، جوانی سروشتی کوردستان بۆ سەرچاوەگرتنی شیعری کاردۆخی هۆکارێکی گەورە بووە .

کاردۆخی لە هۆنراوەدا ڕێچکەی نیشتمانپەروەریو دڵداری گرتووە، بە دوو شێوە زار هۆنراوەی هەیە، بە کرمانجی خواروو بە هەورامی. دیوانێکی چاپکراوی هەیە بەناوی (دیوانی کاردۆخی)، لە ساڵی (١٩٨٢)ز کۆچی دواییکردووە، لەکاتی بینینی تەرمی شەهیدەکان لە حامیەی

سلێمانی شیعرێکی داناوە بەناوی (پیرێکی زانا)، کە بە هەردوو شێوە زاری هەورامیو کرمانجیی خواروو لە دیوانەکەیدا هەیە.

## پیـرێـوی زانـا

**پیرێو ریش چەرمە، دونیا دیدەو ڕاس**

**زاناو فامیدە تەمام پیا خاس**

**ئاماو، دیش وەچەم، کەشو کۆو سارا**

**قەبرۆ شەهیدا، جەدەگاو شارا**

**دیم، هەڕەش پیما، تا واچی فری**

**گرەویو نالێ، دەنگی بەرز چڕی**

**بە کام نەیاوێ چی کوردستانە**

**یەکجار فرێنی چی گۆڕستانە**

**خەفەتی فرەم پەی ئانیشانە**

**بە دەستو وێما، نریەی نیشانە**

**ئازاو گەنجێما، زیاد جەسەدی**

**کرێی دارەرە، بەدەستو بەدی**

**پیرە ئی شیعرا وانێو گرەوێ**

**تا سۆش بیەوە، چاگە مەرد شەوی**

(لەسەرەتاوە سێ دێری بۆ ئەزبەرکردنە)

دیوانی کاردۆخی: چاپی یەکەم ١٩٧٨ بەغدا

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتاکەی |
| --- | --- | --- |
| فریٚ | : | زۆر، پتر |
| گرەویٚ | : | دەگریا، شیوەن |
| چڕی | : | هاوارکردن |
| نەیاویٚ | : | نەگەییو |
| پەی | : | بۆ ئەو |
| ئانیشانە | : | بۆ ئەوانە |
| ویٚما | : | خۆمان |
| نریەی | : | دانرا |
| گەنجیٚما | : | گەنجی، لاوی |
| کریٚی دارەرە | : | کران بە دارا |
| بەدی | : | خراپی |
| تاسۆش | : | سوێی بووەوە، لەهۆش چوو |
| چاگە | : | لەویٚ |
| مەرد | : | مرد |



# ســـــادق بەهائەدین

## ١٩١٨- ١٩٨٢ز

لـە سـالّی (١٩١٨)ز لـە شـاری ئامێـدی لـەدایکبووە، سـەرەتا بـە خوێنـدنی ئـایینی دەسـتی پێکـردووە، لـە پاشـان چـووەتە قوتابخانە، قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەنـدی و ئامـادەیی بـە سـەرکەوتوویی بڕیـوە، لـە خانـەی بلّنـدی مامۆسـتایان لـە بەغـدا وەرگـیراوەو لـە سـالّی(١٩٤٤)ز دەرچـووەو لـە قوتابخانـە ناوەنـدی و ئامادەییـەکان بـووە بـە مامۆسـتا. ماوەیـەکی زۆر لەگەلێك شاری عیراقدا مامۆستا بووە.

ئـەم نووسـەرە زۆر لەمێـژ بـوو خـەریکی خوێندنـەوەی گۆڤارەکـانی (هەوار)و (گەلاوێژ) بـوو، ئـەم گۆڤارانـە زۆر کاریـان کـردە سـەر ڕەوشـی ڕونـاکبیری و سەرچـاوەی هانـدانی بـوون بـۆ نووسـین، گـەلێك گوتـارو نووسینی لە گۆڤارو ڕۆژنامـە کوردییەکانـدا بلاوکـردەوە، ئەنـدام بـوو لـە کۆڕی زانیاری کوردو ماوەیەکیش وانەبێژ بوو لـە بەشـی کـوردی کۆلێـژی ئادابی زانکۆی بەغدا، لە سـالّی (١٩٨٢)ز کۆچـی دواییکـرد، بەرهـەمێکی زۆری لەدوای خۆی بەجێ هێشت گرنگترینیان ئەمانە بوون:

١. ئیدیەمێت کوردی ١٩٧٣.

٢. دیوانا مەلایێ جزیری ١٩٧٧.

٣. دیوانا پـەرتـەیێ هەکاری ١٩٧٨.

٤. نەوبەهارا سەیدایێ مەزن ئەحمەدی خانی ١٩٧٩.

٥. هۆزانڤانێت کورد ١٩٨٠.

٦. خان‌و مان ١٩٨١.

٧. مەولیدا مەلایێ باتەیی ١٩٨٢.

٨. رێزمانا کوردی.

## ئەڤە ژی نمونەییێکە لەنووسینەکانی:

**(سیامەند بازرگانەکێ مەزن بوو، گەلە لێ ب راها ڤێر بوو. خەلکی باژێری ب جارەکی سەر تێ دکر، هەمی پێ تڤییێت خۆ ژێ دکرین ژ بەرکو مرۆڤەکێ راستەگۆ، چاڤ قسەکری، ئاخافتن خۆش، دەستگر، خێرخازو جامێربوو. دلێ کەسی نەدەهێلا، دەست گرتن دگەل ژارو دەست کورتان دکر، ژبەر ڤێ چەندێ گەلەکێ ژ جهێ خۆدا ناڤدار بوو، بەلێ لسەر جامێریو خۆش مرۆڤیا وی ژی را، خودێ ژ رەنگ نەدیتبوو چو بچویک نەبوون).**

(تەنها بۆ خوێندنەوەو راڤەکردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان:

| | | |
|---|---|---|
| سەر تێ دکر | : | سەریان تێ دەکرد، ڕوویان تێ دەکرد |
| پێ تڤێیت خۆ | : | پێویستیەکانی خۆیان |
| دلێ کەسێ نەدهێلا | : | دڵی کەسی نەدەشکاند |
| ژبەر ڤێ چەندێ | : | لەبەر هەندێ، لەبەر ئەوە |
| لسەر جامێریو خۆش مرۆڤیاوی ژی ڕا | : | سەرباری جوامێریو پیاو چاکی ئەو |
| ژار | : | هەژار |



# سوارەی ئێلخانی زادە

## ١٩٣٧- ١٩٧٦

ئـەم شـاعیرە نوێخـوازەی ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان نـاوی (سـوارە ئەحمـەد ئاغـای ئێـلخانی)یـە، لـە شـاری بۆکـان هاتۆتـە دنیاوە، خوێندنی سەرەتاییو ناوەنـدیی لـە سەقزو بۆکانو تاران تـەواوکردووەو پاشـان چووەتە کۆلیجی حقوقی زانستگەی تاران.

سـوارە تـەنیا تەمـەنی منـداڵی بەخۆشـی بردووتـە سـەر، دوای ئـەوە نەخۆشـیو ژێـر دەسـتەیی نەتەوەکـەی هەراسـانیکردووە، لـە سـاڵی (١٩٦١)ز بۆتە ئەنـدام لـە یـەکێتی خوێنـدکارانی کـورد لـە زانسـتگەکانی ئێران، لە پەلامارێکی گەورەی گرتنو ڕاونانی دەزگای پۆلیسـی (شـا)وە، سوارەش کەوتە بەندیخانـەی تارانـەوە لـە بەشـی گرتووخانـەی سیاسـی ئێران.

لە یادی دە ساڵەی کۆچی دوایی ئەم شاعیرەمان، یەکێ لـە نـزیکترین هاوڕێو خۆشەویستی سوارە، بەم جۆرە نووسیویەتیو دەڵێت:

لـە خـۆ شـاردنەوەو هـەڵات هـەڵاتی منداڵانـە ڕا هـەتا خۆشـاردنەوەو هەڵات هـەڵاتی سیاسـەتو کوردایـەتی، لـە بـووکی جـوانی کوردسـتان ڕا هەتا شاری بە گرمـەو دووکـەڵ... چـەند جـارو چـەند سـاڵ پەککـەوتنو تێهەڵچوونەوە، پێشمەرگایەتی منو گیرانی ئەو، گیرانی منو کرمانـەوەی

ئەو لەبەشی کوردیی ڕادیۆی تارانو بە ناچاری لە دووتوێی سەد پەردەی ڕەمزو ڕازدا پێدا هەڵگوتن بە ئازادیو بـە ڕابـەریو بەختـەوەری ئینسـان شیعرو وتاری سیاسیی نووسیوە.

## شـــــــار

گوڵم، دڵم پڕە لە دەردو کوڵ

ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت

ئەڵێم بە جامێ ئاوی کانیاوی دێیەکەم

عیلاجی کەم کوڵی دڵی پڕم لە دەردی ئینتیزارەکەت

وەرز بوو گیانی من لە شارو هارە هاڕی ئەو

لە ڕۆژی چڵکنی نەخۆشو تاویادی شەو

★★ ★★ ★★

ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت

لە شاری چاو لەبەر چرای نیئۆن شەوارەکەت

بڕۆمە دێ کە مانگەشەو بزێتە ناو بزەم

چۆن بژیم لە شارەکەت

کە پڕ بە دڵ دژی گزەم

لە شارەکەت، کە ڕەمزی ئاسنو منارەیە

مەلی ئەوین غەوارەیە

ئەڵێی لە دەوری دەستو پێم

ئەوەی کە تێلو تانو ڕایەڵە، کەلەبچەیە

ئەوەی کە پەیکەرە میسالی داوەڵە

لە شارەکەت کەمەندی دووکەڵە

کە دێتە دەر لە ماڵی دەوڵەمەند

بە دارە تەرمی کووچە تەنگەکانی شارەکەت

ڕانەهاتووە لەشم

بناری پڕ بەهاری دێ

ڕەنگی سوورو شین ئەدا

لە شیعرو عاتیفەی گەشم

ئەڵێم بڕۆم لە شارەکەت گوڵم

(تەنها سێ دێری یەکەم بۆئەزبەرکردن)

## لێکدانەوەی وشەکان:

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| گوڵم | : | خۆشەویستەکەم |
| نوێخواز | : | ڕێبازی نوێ، لادان لە ڕێبازی کۆن |
| زانستگە | : | زانکۆ |
| هەراسان | : | پرزەی لێبڕیوە، بێتاقەتی کردووە |
| کوڵ | : | ئازار، حەسرەت |
| تاویاد | : | تاو لەرز |
| نیئۆن | : | گلۆپی نیۆن |

| | | |
|---|---|---|
| شەوارە | : | تیشکێکی بەهێزە کە شەو بۆ ڕاوکردنی باڵندە بەکاری‌دەهێنن لێرەدا بە واتای ڕوناکییەکی بێئەندازەیە کە چاو لەبەری هەڵنایە. |
| بزێتە | : | دەرکەوێ، دەرکەڤی |
| بزە | : | خەندە، خۆشی‌و شادی |
| ئەوین | : | ئەڤین، عەشق |
| غەوارە | : | بێگانە، نەناس |
| کرمانەوە | : | ماتبوون، گیرسانەوە |
| گرتووخانە | : | بەندیخانە، حەپسخانە |
| هەڵات هەڵات | : | ڕاکە ڕاکە |
| تێل | : | تەل |
| داوەڵ | : | کەلاشێکی گەورەو ناقۆلا |
| کەمەند | : | زنجیرێ، گوریسێ کە خەڵکی پێبگرێ (ناوقەدی مرۆڤ)، لێرەدا مەبەستی دووکەڵەکە بۆتە کەمەند بۆ شاری تاران |
| عاتیفە | : | هەست‌و شعور |

## ئەحمەد دڵزار




ناوی (ئەحمەد مستەفای حەمە ئاغای حەویزی)یە، لە ساڵی (١٩٢٠)ز لە شاری کۆیە هاتۆتە ژیانەوە، هەر لەسەرەتای ژیانیدا بە خوێندنەوەوە زۆر خۆی خەریککردووە، لە تەمەنی لاویدا کەوتۆتە خەباتی نیشتمانپەروەرییەوە، لەم ڕێگەیەوە زیندانو ئازارو ئەشکەنجەی زۆری دیوە شاعیری خەباتو ژیان زۆر باش لەوە گەیشتووە، کە دەبێت خەبات بۆ کۆمەڵانی فراوانی گەل بێت، لەبەر ئەوە دەبینین شیعرەکانی دەخاتە چوارچێوەیەکی ئەوتۆی شیعرەوە، کە بەشێکی زۆر لە زەحمەتکێشان تێیبگەنو بیکەنە گۆرانیو سرودی کاروانی خەباتی خۆیان، وەک دەڵێت:

**کارگەرین جەنگاوەرین ڕەنج بەرین تێکۆشەرین**

شیعرەکانی مێژوویەکی خوێناوی ڕێکخراوی چینی کرێکارانی عیراق بە گشتیو کورد بەتایبەتی باسدەکات، چونکە دڵزار لەناو ئەو ژیانە سەختەدا پەروەردە بووە، دڵزار دەستێکی باڵای هەبووە لە وەرگێڕاندا، ئەمەش لە ئەنجامی زیرەکیو شارەزایی شاعیرە لە زارەکانی کوردیو ئەدەبی بێگانەدا، بەڵگەشمان بۆ ئەوە:

١. **گەنجینە**: کۆمەڵە چوارینەکانی بابە تاهیرە کە لەشێوەی لوڕییەوە کردوویەتی بەزاری کرمانجی خواروو.

٢. **پێکەنینی بەهار**: کە بەشێکە لە وەرگێرانی شیعری شاعیری بەناوبانگی فەرەنسی (ڤیکتۆر هیگۆ) بۆ سەر زمانی کوردی، کە سەرەتاکەی دەڵێت:

**وا گەڕانەوە ڕۆژە درێژەکان    بەجۆش و خۆشی ڕووناکی پەخشان**
**ئەمەیە بەهار ئازارو نیسان    هاتن پێکەوە ڕووخۆش خەندان**

ئەحمەد دڵزار دوو بەرهەمی بە چاپ گەیشتووە بەناوی (ئاوازی ئاشتی)و (خەبات و ژیان). دڵزار هەر ئەو شاعیرە نییە کە شیعرەکانی، هەر بۆ مەبەستی سیاسی تەرخان کردبێت، بەڵکو شاعیر سروشت و بەهارو دیمەنی کوردستانی جوانیشی کردووە بە هەوێنی شیعرەکانی، ئەم هەستە ناسکەو سۆزە بەرزەی شاعیر لە شیعری (مانگی گوڵان)دا دەردەکەوێت:

## مانگی گوڵان

**مانگی گوڵانە گوڕەی بەهارە**
**زەمین سەراپا باخ و گوڵزارە**
**مافووری سەوزی هەردان گوڵ گوڵە**
**گوڵشەن بە جاریٚ پڕ لە بولبولە**
**سەراپا شاخ و باخ و دۆڵ و دەشت**
**چاو ئەندازێکن لە باخچەی بەهەشت**
**پۆلێ کەنیشك و دەستەی دڵداران**
**هاتوچۆیانە لەنێو گوڵزاران**
**منداڵی ورد وێنەی کارژۆڵان**
**پەرت و پەخشانن لەناو مێرگوڵان**

گەلــەی گــاكێوی و كەروێشــك و ئاســكان
پــــەرتانن بــــە دەم هەڵــــدێرو باســـكان
ئــــاوی كانیـــــاوی ســـــاردو ســـــازگار
لــــە ژێــــرو قــــەدی كێــوان دێتــــە خــــوار
لــــە لایــــێ شــــەپۆڵ شــــڵە شــڵپ ئــــەكا
لـــــەلایێ ئــــاگر كڵپـــــە كڵــــپ ئــــــەكا
لایـــــــەكیش گـــــــردو هــــــــەورازو ڕازە
دامێنـــــــی جێگـــــــەی یــــاریی ســـــێبازە
وردو درشــــــــــت و كـــــــــچ و ژن و ژاڵ
منـــــــداڵ و گـــــــەورە، پیــــــاوو كوڕوكـــــاڵ
گشـــتی سەرخۆشــــی جـــوانیی سروشــــتن
بەرانبـــــەر نەغمـــــەی بولبـــولان وشـــتن

(سێ دێری بۆ ئەزبەركردنە)

## ڕاڤەكردنی پەیڤەكان

| پەیڤ | | واتاكەی |
|---|---|---|
| مانگی گوڵان | : | دووەم مانگی بەهارە (نیسان) |
| گوڕەی بەهار | : | جۆش و خرۆشی بەهارە |
| چاو ئەندازە | : | دیمەنێكی دڵرفێن |
| پۆلێ كەنیشك | : | پۆلێ كچ |
| پەرت و پەخشان | : | بلاوبوونەتەوە |
| ئاسكان | : | ئاسك، مامز |
| باسكان | : | باسك، باسكی چیا، قەدی چیا |
| كڵپەی ئاگر | : | گڕی ئاگر |

| | | |
|---|---|---|
| سێباز | : | یارییەکی کوردەوارییە |
| سەرخۆش | : | سەرمەست، خۆشییەکی بێ ئەندازە |
| وشتن | : | هەستیارن، حەساسن، گوێکراوەن. |
| هەردان | : | هەرد، زەوی |
| گوڵشەن | : | گوڵزار |
| گەلە | : | ڕەوە، ژمارەکا زۆر |
| پەرتانن | : | بڵاون |
| شلپە شلپ | : | هاژە هاژی ئاو |

## بۆ زانین:

### ناوی مانگە کوردییەکان ئەمانەن:

١. **وەرزی بەهار**: نەورۆز، گوڵان، جۆزەردان.

٢. **وەرزی هاوین**: پووشپەڕ، خەرمانان، گەلاوێژ.

٣. **وەرزی پاییز**: ڕەزبەر، گەڵاڕێزان، سەرماوەز.

٤. **وەرزی زستان**: بەفرانبار، ڕێبەندان، ڕەشەمێ.

## ئەو سەرچاوانەی بۆ نووسینی هەردوو بابەتی ڕێزمان و ئەدەب سوودیان لێوەرگیراوە:


١. ڕێزمانی کوردی- ناو- د. ئاورەحمانی حاجی مارف
٢. ئاواو دەستوورا زمانێ کوردی،جگەرخوێن
٣. ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد
٤. ڕێزمانا کوردی، صادق بهاوالدین
٥. ڕێزمانی کوردی پ. کوردۆییف، د. کوردستان موکریانی لە ڕوسیەوە کردوویە بە کوردی.
٦. ڕێزمانی کوردی، نوری عەلی ئەمین
٧. دیوانی پێنجوینی کۆکردنەوەو ئامادەکردنی/ ئومێد ئاشناو عبدالکریم موفتی.
٨. یادی موفتی، کوکردنەوەی بورهان قانیع.
٩. ئەسیری شاعیرێکی شۆڕشگێڕی، قۆناغی دوای حاجی قادری کۆییە، جەبار جەباری.
١٠. سەرجەمی بەرهەمەکانی: شەهید مارف بەرزنجی، کۆکردنەوەو ڕێکخستنی سامان مارف بەرزنجی و عمر معروف بەرزنجی.
١١. دیوان دڵدار.
١٢. دیوانی کاردۆخی.


زۆر سەرچاوەی تریش....

# ﴿بەشی خوێندنەوە﴾

١. شێخ مەحمودی نەمر.
٢. هەمیشە بەدەم ژیانەوە پێبکەنە.
٣. زانست شتی سەیر دەدۆزێتەوە.
٤. مۆسیقا
٥. چۆن دەخوێنیتەوەو چی دەخوێنیتەوە.
٦. ئەشکەوتی شانەدەر.
٧. ئەدیسۆن.
٨. یەکی ئایار
٩. هەڵە بجەی شەهید
١٠. شۆڕشی مەزنی ئەیلولی ١٩٦١ز
١١. خێزانێکی ئاوارە
١٢. بەردە قارەمان
١٣. دهۆك
١٤. ئافرەتی کورد
١٥. میـــدیا

## شێخ مەحمودی نەمر

نامـــەوێ ژینـــی ئەســـارەت، بەســـە عـــومری گـــومڕەهی
نـــای کەمـــە ســـەرخۆم بەدەســـتی مـــودەعی تـــاجی شـــەهی
قـــەت بـــە ئـــەمری دوژمنـــانم نامـــەوێ فەرمانـــدەهی

نوربەخشی[1].

((... لەناوچەی پیلانو پرۆژەی چەپەڵی بێگانەدا، کە وەك دومەڵی تەقیو لە م سەر بۆ ئەو سەری وڵات زوخاویان لێدەتکا، ئەو وڵاتەی کە شەرو چاوچنۆکیی ئەوان لە پەلو پۆی خستبوو، هەمیشە بەبێ ئاسودەگیو حەسانەوەو چەمانەوە تێدەکۆشاو بێوچان بۆ پێشەوەترو بەبێکۆڵدان بەرەو ئامانجی پیرۆزی خۆیو گەلەکەی کە ئازادکردنی کوردستانی ئازیز بوو هەنگاوی دەناو پەلی دەهاویشت، بێ ئەوەی بسڵەمێتەوە، هەر بەو باوەڕەوە حەفتا ساڵی بردە سەر، کە مێژوو شاهیدی لاوچاکیو هونەرمەندیو قارەمانی ئەو ساڵانەی خۆیو گەلەکەیەتی.

بپرسە لە سوپێرەکانی (ناڵەشکێنی) لە بۆکانو ئێسكو پۆستی سۆلداتی قەیسەری ڕوس، بپرسە لە هۆڕاو و دەشتەکانی شوعەیبەو لاکی بۆگەنی تۆپیوی ئینگلیسی نەگریسی نامەرد. بپرسە لە پیرانو مەریوان. بپرسە لە سورداش، ئەشکەوتی جاسەنەو فرۆکە ڕەشەکە. بپرسە لە

---

(١) (نوربەخشی) تەخەلوسی شاعیرانەی شێخ مەحمودی نەمر بوو، بە کوردیو فارسی شیعری هەیە.

دەربەندی بازیانو دەشتە تاڵو گرێزەو کەناروێو ئاوبارێك. بپرسە لەو بۆمبە هەرە گەورانەی ئەو زەمانە. بپرسە لە شاخو کێو و دۆڵو شارو دارستانو ئەشکەوتەکانی کوردستانو مێژووی دوژمنانی خوێنڕێژ وەڵامت دەدەنەوە، بۆتی دەردەخەن کە چ پاڵەوانێك بوو، چ ڕۆڵەیەکی کورد بوو، کە کوردستان شانازیی پێوەبکات، تاکو ماوە ناحەق نییە. ئەگەر وەڵامت وەرنەگرتەوە بپرسە لە (بەردەقارەمان)، لە هیندستانو کوێتو بەغداو ناسریەو ڕومادیو داریکەلی، کە تا چ ڕادەیەك توانادارو لێبڕاو و خۆڕاگرو نەچەماوە بوو. بپرسە لە ساڵی (١٩١٨)، قارەمانی سۆڤێتی مارشال (بۆدیۆنی) وەڵامت دەداتەوە، کەوا بۆچی پەناو هانای بردە بەر شۆڕشگێرانی ئۆکتۆبەری مەزن، کە داوای یارمەتیو کۆمەکی لێکردن، پێت دەڵێت، بۆ ئازادکردنی کوردستان بووە.

بپرسە لە کارەساتی موسڵ، بۆت دەگێرێتەوە کە ئەو خوێنە پاکانە چۆن لە ڕێی ئازادیی کوردستانو سەربەخۆیی و وڵات پەرستیدا بەدەست دوژمنی نارەزا بەو باوەڕە بە ناحەق ڕژێنرا.

بپرسە لە سەرۆکی دادگای سوپای ئینگلیز لە ٢٥ی تەمووزی (١٩١٩)دا، بۆت دەگێرێتەوە بۆچ فەرمانی بە خنکاندنی ئەو قارەمانە نەمرە دا. پێت دەڵێت لەبەر ئەوەی داوای ئازادیی کوردستانی دەکردو ڕێگەی نە دەدا سوپای ئینگلیزو خوێن مژەکانی دەم بنێنە سامانی وڵاتو ناو جەرگی گەلی کوردەوە.

بپرسە لە مەیدانو بانەو دۆزەخ دەرەوە نەڵێنو کۆنەشارو خۆییو سەلماسو چاریەو دەشتی مەرگەوەرو تەرگەوەڕو لاجان، بلێ بۆچی

ماڵو منداڵی شێخ مەحمود گەیشتنە لای ئێوە؟ وەڵامت دەدەنەوە، ئەگەر هەر نەبوو زێوەری شاعیری کورد ئامادەیە وەڵامت بداتەوە، چونکە لەگەڵیان بوو.

پێت دەڵێت لەبەر داواکردنی ئازادیو سەربەخۆیی خواستنو ڕازینەبوونی داگیرکەرانی ئینگلیز بوو وامان بەسەرهات.

بپرسە لە نەخۆشخانەی بەغداو بڵێ: بۆچی ئەو قارەمانەتان بە پیریو چوونە ساڵی عومرەوە کوشت؟

(بپرسە لە ڕژێمو نۆکەرو یاساوڵ کە بۆچ تەرمی نازداری ئەو ڕابەرەتان گوللە باران کردو بە مردوویی برینداردتانکرد؟). بۆت دەگێڕنەوە کەوا (لە ژیانو مردندا) ترسێکی گەورەو کۆسپێکی سەخت بوو لە ڕێی ئازاردانو چەوساندنەوەی بێنەوایانی کورد، کەوایان دەزانی بەوە ڕێیان بۆ بەرەڵلا دەبێت، دەتوانن بکەونە جلیت بازی. بە بیریانا نەدەهات کەئەو زنجیرە دەپچڕێتو ئەلقەکانی لەیەك دەترازێنو شۆڕشی چواردەی تەموزی دێتە بەرەوەو تەختو تاراجیان تێکدەدات.

بەڵێ قارەمانی نەمر، ڕۆڵەی نەتەوەی کوردی نەبەزو چقڵی چاوی دوژمنان، ئاوێکی ڕشتی کە تا وڵاتێکی ئازادو گەلێکی شادی پێدەگات وشك نەبێتەوە، مێژووی کوردی سەربڵندو خاوێنکردەوەو هیواو ئایینی گەلی تازە کردەوە.

ئەگەر بەهۆی زوڵمو زۆرداریی داگیرکەرانو نا تەواو و خۆپەرستەکانی ناوخۆی نۆکەرو هەڵکەوتی جوگرافیی وڵاتەکەیەوە سەرنەکەوتبێتو نەگەیشتبێتە ئامانجو بە غەدرلێکراو سەری نابێتەوە. هەرگیز غەدر

ناتوانێت له شهخسیهتی ئهو کهم بکاتهوهو ئالآیهك، که ههڵیکردووه بینهوێنێت. ئهو ئالآیه ههمیشهو به درێژایی ژیانو مێژووی کوردستان به بهرزییهوه دهشنێتهوهو به شانازیو سهربڵندی بههیواو سروودی خۆشنودی کورد دهلهرێتهوه.

تا کوردیش ما بێت، یادی (شێخ)ی نهمرو قارهمان له دڵیدا دهمێنێتو که سهیری شاری ههڵمهتو قوربانی دهکات، دێره شیعرهکهی (حهمدی) دهڵێتهوه:

**وهك مهدینه بێ نهبی بێ، یا نهجهف بێ بێ عهلی**

**شاری (غهزنه)ش ئێسته بێ مهحموده وهك داریکهلی**

له وتارێکی (مهحمود ئهحمهد)

به دهستکاری

## ڕاڤەكردنی پەیڤەكان

ناوچە : هەرێم، دەڤەر

چەپەڵ : چڵكن، پیس، قرێژ

بێگانە : بیانی

تەقیو : پەقی

چاوچنۆكی : ڕژد، ڕەزیل چاوبرسی

ئاسودەگی : تەناهی

چەمانەوە : كوڕبوونەوە

بێوچان : بێپشو، بێوەستیان

بۆ پێشەوەتر : پێشڤەتر

ئامانج : ئارمانج

هەنگاو : شەقاو، پێنگاڤ

پەل : دەست

بسلەمێتەوە : ڤەچنقی

پێوە بەستراو : پێڤە گرێدای

ئاین : ڕێگە، ڕەوشت

سوپێر : سەنگەر

ئێسك : ئێسقان، هێسك، هەستی

پۆست : پێست، چەرم

سولْدات : سەرباز (بەرووسی)

لاك : كەلاك، كەلەخ

| | | |
|---|---|---|
| تۆپیو | : | فەتسی، مردارەوەبوو. |
| واشە | : | مەلێکی گەورەیە لە باز دەچێت. |
| برسی | : | برچی، ورسك |
| فرۆکە | : | باڵەفڕ |
| شاخ | : | کێو، کەژ، چیا |
| دۆڵ | : | نهال، شیو |
| شار | : | باژێر |
| ئەشکەوت | : | شکەفت |
| خۆڕاگر | : | خۆگرتی |
| کۆمەك | : | یارمەتی، ئاریکاری |
| بڵێ | : | ببێژە |
| ئامادەیە | : | حازرە |
| تەرم | : | جەندەك، جەنازە |
| بێ نەوایان | : | بەلەنگازان |
| هەڵکەوت | : | بار، وەزع |
| لەپەلوپۆی خستبوو | : | شپرزەی کرد، جوڵەی لێبری |
| بۆتی دەردەخەن | : | بۆ تە ئاشکرادکەن |
| وامان بەسەر هات | : | ئۆسا ب سەرا مە هات |
| جلیت بازی | : | جۆرە یارییەکە |

## گفتوگۆ:

١. لەم باسەدا ناوی گەلێك شوێن هـاتووە، هەنـدێکیان لەکوردسـتانی عێراقــن‌و هەنــدێکیان لــە خــوارووی عــێراق‌و هەنــدێکیان لــە کوردستانی ئێران‌و هەندێ شوێنی تـر. پەیوەنـدی ئـەم ناوانـە بـە مێژوو و خەباتی شێخی مەزنەوە چییە؟ لە مامۆستات بپرسە.

٢. شیعری کـام شـاعیرت لەبـەرە کـە باسـی شـێخ مـەحموودی نـەمر بکات؟ لە کتێبخانەی شارەکەتدا بۆیان بگەڕێ.

٣. نووسەر لەم باسەدا فەرمانی (بپرسە) دەخاتە پـێش ڕسـتەوە، لـە کاتێکـدا کـە بـەپێی ڕێزمـانی کـوردی دەبێـت بکەوێتـە پاشـەوە. دەزانیـت بـۆچ؟. بـۆ ئـەوەی گرنگـی بـدات بـە پرسـیارەکە بـا مامۆستات باشتر تێت بگەیەنێت.

## هەمیشە بەدەم ژیانەوە پێبکەنە

ئەگەر ڕووخۆش بیتو بەدەم ژیانەوە پێبکەنیتو هەمیشە ڕوناک بین بیت، هیوا بەهاتنەدیی ئامانجەکانت پەیدا دەکەیتو پشتت بەسەر کەوتن قایم دەبیتو بۆ خێرو خۆشی خۆتو خەڵك باشتر بیر دەکەیتەوە، بەڵام ئەگەر ڕووترشو مۆن بیتو وا بزانیت دنیات بەسەرداکەوتووەو هەمیشە تاریك بین بیت. ئارەزوو و ئامانجەکانت یەك بەدوای یەکدا دەمرنو هەمیشە پەککەوتەو وزەلێبڕاو و سەرلێشێواو دەبیت، ئەوسا نە خۆت خێرو خۆشی لە خۆت دەبینیتو نە خەڵکیش سودت لێوەردەگرن. بەڵێ ئەوانەی هەمیشە بەدەم ژیانەوە پێدەکەنن، کاری گەورە گەورەیان لە دەست دێت چونکە نە لە تەنگوچەڵەمە سڵدەکەنەوەو نە باری گرانی ڕۆژگار ئەژنۆیان دەشکێنێت.

بڕوابکەن ئەگەر ئێستا لێم بپرسن تۆ پارەو ماڵی دنیات دەوێت یان دڵنیاییو دڵو دەرونێکی دەم بە پێکەنین، یەکسەر بێ سێو دوو لێکردن دەڵێم دڵنیاییو دڵو دەرونێکی دەم بە پێکەنینو گەشاوە، چونکە پارەو ماڵی دنیام بە پەستیو مۆنییەوە بۆ چییە؟ چی لە پایەی بەرز بکەم ئەگەر هەمیشە پەستی دایگرتبمو بەری دڵم گیرابێتو وەکو پاپۆڕەکەم نوقم بووبێت وابم.

ئێوە سەیربکەن دایکێکی گرژومۆن لە ماڵدا، ماڵەکە دەکات بە دۆزەخ کەچی دایکێکی ڕووخۆشو دەم بە پێکەنینو دڵو دەروون فراوان ناومال دەکات بە بەهەشتو وەکو گوڵاوی پیادا بپرژێنێت ئاوایە.

ئێوە سەیری گوڵو گوڵزارو کارژۆڵەو بەرخۆڵەی قەدپاڵو جریوەو جووکەکەی بولبولو باڵدارو ئێسکی سوکی منداڵانو هاوارو هاژەی تاڤگەو قەڵبەزەو شەپۆڵی پەڵە گەنم بکەن، ئەگەر سەیرکردنەکەتان بە ڕوویەکی خۆشو دەم بە پێکەنینەوە بوو ئەوا ئەم دیمەنانەتان جوان دێتە بەرچاو، بەڵام ئەگەر پەستو خەمبارو لێوبەبارو تاریکبین بن ئەوا ئەو هەموو جوانییانە نابینن.

ئەگەر دەتەوێت ڕووخۆشو دەم بە پێکەنین بیت، دەبێت هەمیشە بەرەنگاری پەستیو دۆشدامان ببیت، ئەوەش بزانە هەر کاتێك بکەویتە خۆت بۆ کارکردنو کاروبار جێبەجێکردن، ماوە هەیەو دەرگای سەرکەوتن لەسەر پشتە، ئەگەر دەتەوێت هەمیشە بەدەم ژیانەوە پێبکەنیت، دەبێت ماوە بدەیت بەخۆتو بهێڵیت کە خونچەی هیوا لە دڵو دەروونتا چەکەرە بکات، تا وردەوردە دەم دەکاتەوەو دەگەشێتەوە، دەبێت هەمیشە چاوەڕوانی کاری باش بیت نەك خراپ.

ئەگەر وا بزانیت کە هیچ نیتو هیچت لەدەست نایەت ئەوا دوادەکەویتو هیچ بەهیچ ناکەیتو ناتوانیت بەدەم ژیانەوە پێبکەنیت، بەڵام ئەگەر وا بزانیت کە شتت لەدەست دێتو هیچت لە کەس کەمتر نییە، ئەوا هەر لە خۆتەوە هەست دەکەیت کە بەکارو بە توانایتو هەموو شتێکت لە باردایەو چاوت لە ئیش ناترسێتو دەتوانیت کێو ببڕیتو هەمیشە زەردەخەنە لا لێوتی گرتووە. تۆ ئەو مەبەستو ئامانجەی خۆت دەستنیشان بکە ئیتر با دوورو گرانیش بێت، هەر دەیگەیتێ، چونکە هەر ڕۆژە هەنگاوێکی بۆ دەهاوێژیت.

ئـەو دڵو دەروونانـەی بـەدەم ژیانـەوە پێدەکـەنن، کـە کـاریگرانو سەخت دەبینین پێکـەنینیان دێت، هەرکـە دەسـت دەدەنـە کارەکـە تـا ئەنجامی دەدەن ڕوویان خۆشەو هەمیشە دەم بـە پێکـەنینن. بـەڵام ئـەو دڵو دەروونانەی تاریكو پەستن هەر لەگـەڵ بینینـی کارێکدا دەتـۆقێنو هێزی ئەژنۆیان دەشکێت.

بەڕاستی هەندێك هەن زۆر سەیرن، حەز بەسـەرکەوتن دەکـەن، بـەڵام بە مـەرجێك بۆیـان هیچـی تێنەچێتو هـیچ خۆیـان هـیلاك نەکـەن وایـان دەوێت هەموو شتێکیان لـە ئاسمانـەوە بـۆ بکەوێتـە خـوارەوەو یـا لـەبن زەوەیدا کوپەڵەی زێر بدۆزنەوە، ئەگەر ئەمانەیان بۆ نەبوو پەستی دایان دەگرێـتو خۆیـان لـە زەردەخەنـەو پێکـەنین دەتـۆرێننو لـچ دەدەن بەیەکدا.

ئەی قوتابی خۆشەویست هەمیشە بەدەم منداڵی ناو بێشـکەو بـەدەم کرێکـارو جوتیـارو پـیرو لاو و کـەسو کـارو خوشـكو بـراو ناسـیاوەوە پێبکەنە، ئەگەر گرفتێك هاتە ڕێگات سەری دنیات لێنەیەتەوە یەك بەڵکو زەردەخەنە بتگرێت. لەسەر کەوتنو سەرنەکەوتندا هەر پێبکەنە، بەهـەر چـوار لای خۆتـدا پێکـەنین وەك گـوڵاو بپرژێنـە، چـونکە دەبێتـە هـۆی سەرکەوتنو گرەو بردنەوەت[1].

---

(١) لە کتێبی خوێندنەوەی عەرەبی بۆ پۆلی دووەمی بنەڕەتییەوە وەرگیراوە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتا |
|---|---|---|
| پەککەوتە | : | کەڤنار |
| وزەلێبڕاو | : | بێوەج |
| تەنگوچەڵەمە | : | ئاستەنگ |
| دۆشـداماں | : | دەست کێلەك |
| چەکەرە | : | شینبوون |
| بپرژێنە | : | برژێنە |

### گفتوگۆ:

١. بۆچی ئارەزوو و ئامانجەکانی مرۆڤی ڕووترش‌و مۆن دەمرن؟

٢. هەندێك کەس هەیە، کە ڕقیان هەڵدەستێت یان گاڵتـەیان لـە شـتێك دێت بە تەوسەوە زەردەخەنەیەك لالێویان دەگرێـت، ئایـا دەتوانیـت ئەو زەردەخەنەیە لە زەردەخەنەیـەکی تـر جـودا بکەیتـەوە، کـە لـە دڵخۆشی‌و خۆشەویستییەوە هەڵقوڵابێت.

٣. دەڵێن لە کاتی سەرنەکەوتنیشدا هەر دەبێت پێبکەنین، ئایا تۆ ئـەم قسەیە بە ڕاست دەزانیت؟ پێکەنینی مرۆڤـی سـەرنەکەوتوو سـودی چییە؟

٤. دەبێت بە چ شـێوەیەك بـەدەم کـاری گـران‌و گـیرو گرفتەکانمانـەوە بچین؟

## زانست شتی سەیر دەدۆزێتەوە

زانست هەموو ڕۆژێك شتی نوێ دەدۆزێتەوە، دەگەڕێتو دەپشکنێتو ورد دەبێتەوە شتی وامان پیشاندەدات سەرمان سوڕدەمێنێت، شتی وا کە هەر نەمان بیستبوو یان بە هەڵە بۆی چووبووین، ئەم شتانە زۆرن گەلێك جۆرن ئێمە هەندێکی دەخەینە پێش چاو.

**ڕووەك هەیە مۆسیقای بۆ لێبدەیت هەڵدەپەڕێت:**

دوو زانای هیندی دکتۆر (سنگ)و دکتۆر (پانیاها)، ئەمەیان دۆزییەوە، هەموو بەیانییەك بۆ ماوەی بیستو پێنجو دەقیقە مۆسیقایان بۆ هەندێك ڕووەك لێدەداو لەگەڵ مۆسیقا لێدانەکەشدا سەیری پرۆتۆپلازمی ناو سێلی ئەو ڕووەکانەیان دەکرد. سەیریانکرد تا مۆسیقاکە لێبدرێت ئەو پرۆتۆپلازمە خێراتر دەجولێتەوە مۆسیقا نەما پرۆتۆپلازمەکە وەکو خۆی لێدێتەوە.

ئەو ڕووەکەی تاقییان دەکردەوە پێیدەڵێن (مۆمۆزا) دووان لەو مۆمۆزانەیان لەیەك ڕۆژدا ڕواند خاکی هەردووکیان وەك یەك بوو، وەك یەکیش خزمەت دەکران، بەڵام ئەوەندە لەیەك دووربوون، کە مۆسیقایان بۆ یەکێکیان لێدەدا، دەنگەکە نەدەگەیشتە ئەوەکەی تریان، لە دواییدا کە ڕوانو گەورە بوون، سەیریانکرد ئەوەیان، کە مۆسیقاکەیان بۆ لێدابوو، ئەوەندەو نیوی ئەوەیان، کە مۆسیقای بۆ لێنەدراوە درێژ بووە.

به ڕووەکدا دەزانین ژێر زەمین چ کانزادێکی تیادایە گیایەك هەیە پێیدەڵێن (ئەفسنتین) ئەمە ئەوەیە، کە (ئیبنول بەیتار) ناوی نابوو (دەمەسیسە) ئەمە لە هەر ناوچەیەکدا بڕوایە، مانای وابوو ئەو ناوچەیە (مەنگەنین)ی تێدایە، هەندێك ڕووەکی تر هەن لەهەر شوێنێکدا بڕوێن، مانای ئەوەیە ئەو شوێنە ئاسنی هەیە.

دەستەیەك لە جیۆلۆجییەکانی کازاخستانی وڵاتی سۆڤێت، شوێنێکیان دۆزییەوە پڕ بوو لە گوڵە وەنەوشە، وای بۆ چوون، کە ئەو شوێنە نەوتی ببێت، دوای ئەوە دەستیانکرد بە گەڕانو زەوی هەڵکەندن، لە ئەنجامدا بۆیاندەرکەوت، کە بۆچوونەکەیان ڕاستەو نەوتیان دۆزییەوە.

وە نەبێت ئەم دۆزینەوەیە شتێکی ڕێکەوت بێت، چونکە ئەوی ڕاستی بێت، لە نێوانی ڕووەكو کانزادی ئەو خاکەدا، کە ڕووەکەکەی تێدایە، پەیوەندییەکی گەورە هەیە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە ڕووەك بۆ نەشونماو گەورەبوون پێویستیی بە کانزادە، ئەگەر ئەو کانزادە پێویستە لە خاکی ڕووەکەکەدا ببێت، ئەوا ئەو ڕووەکە باش دێتە بەرهەمو جوان دەبێتو سەرنج ڕادەکێشێت.

### زیندەوەر یارمەتی یەکتر دەدەن:

ئەوەی تا ئێستا سەرنجمان داوە ئەوەیە، کە زیندەوەر پەلاماری یەکتر دەدەنو یەکتر ونجڕونجڕ دەکەن، بەڵام ئەوەی زاناکان دۆزیویانەتەوە پێچەوانەوەی ئەم سەرنجەی ئێمەیەو مەرج نییە هەموو

زیندەوەر وابێت، ئەو زانایانە دەڵێن هەندێك زیندەوەر هەن لە ژیانو گوزەراندا یارمەتیی یەكتر دەدەن، بۆ نمونە دەڵێن باڵدارێكی بچوك هەیە كاتێك كە نەهەنگ لمۆزی لەناو دەردێنێت ددانەكانی جیردەكاتەوە، ئەم باڵدارە بچوكەیە دێت بە دەنووك بەردەبێتە ئەو خۆراكەی لەنێوان ددانەكانی نەهەنگەكەدایەو دەیخوات، بەم كارە خۆی تێردەكاتو ددانەكانی نەهەنگیش پاكوخاوێن دەكاتەوە، لەبەر ئەوە ئەم باڵدارە ئەم كارەی پێ خۆشەو نەهەنگەكەش ڕازییە، بۆیە تەواو ددانەكانی بۆ جیردەكاتەوەو نقەی بۆ ناكات تا باڵدارەكە لەكاری خۆی دەبێتەوە.

زاناكان لەم دواییەدا جۆرە پێكەوەژیانێكی بەخۆشیو ئاشتییان لەنێوان دوو جۆر زیندەوەری جیاوازدا دۆزییەوە، یەكەمیان مێروولەیە، كە پەلاماری چرۆ زەبەندەكانی ئەمریكای ناوەند دەداتو چیی بەر چنگ بكەوێت دەیخواتو دەیماشێتەوە، جۆرەكەی تریان باڵدارێكە، كە لەپێش ئەو جۆرە مێروولەیەدا پەلاماری ئەو ناوە دەداتو جرو جانەوەری دەخوات، بەڵام سەیر ئەوەیە دەست بۆ ئەو جۆرە مێروولەیە نابات ئەگەرچی تا بڵێیت بۆ ئەو باڵدارە خۆراكێكی نایابە. هەروەها ئەو مێروولەیە بەلای ئەو باڵدارەدا ناچێتو هەقی نییە بەسەرییەوە لەگەڵ ئەوەشدا، كە پەلاماری هەموو زیندەوەرێك دەداتو هەموویان پەریشان دەكات.

### چاو لە ئاسماندا:

مانگە دەستکردەکان چاوی دەستکردی هەستداریان پێوەیە، ئەم مانگە دەستکردانە بەهۆی ئەو چاوانەوە دەتوانن وێنەی هەموو شتێك لەسەر زەوی بگرن، هەرچییەك هەبێت لەسەر زەوی لە سوپاو لە فڕۆکەخانەو شوێنی موشەك تەقاندنو وێنەی هەموویان دەگرێت.

ئەوە شتێکی دیارە، کە زەوی بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە، هەروەها مانگە دەستکردەکانیش بە دەوری زەویدا دەسوڕێنەوە، لەبەر ئەوە ئەم مانگە لەیەك شوێندا نینو بە هەموو شوێنێکی زەویدا تێپەڕ دەکەن ئەو چاوە دەستکردانەی بەو مانگانەوەن وێنەی هەموو شتێکی سەر زەوی دەگرن، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو ئەو وێنانە لەوێوە دەنێرن بۆ ئەو زانایانەی لەسەر ڕووی زەوییەوە سەرنجیان لێدەدەنو چاودێریان دەکەن.

لە کتێبی خوێندنەوەی عەرەبی،
پۆلی دووەمی بنەڕەتییەوە وەرگیراوە

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| | | |
|---|---|---|
| پشکنین | : | لێگەڕمان |
| وەنەوشە | : | بە نەفش |
| کانزاد | : | مەعدەن |
| نەهەنگ | : | حوت |

## گفتوگۆ:

١. بە چ تاقیکردنەوەیەك زانرا هەندێك جۆری ڕووەك بە مۆسیقا نەشونمادەکەن؟

٢. چۆن بە هەندێك ڕووەکدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەو خاکەی ڕووەکەکەی تیادا نێژراوە، چ جۆرە کانزادێکی تێدایە؟

٣. ئایا دەتوانیت یەك دوو نمونە لە یارمەتیو پێکەوە ژیانو گوزەرانی زیندەوار بهێنێتەوە؟

٤. هەندێك سودی مانگی دەستکردمان بۆ باس بکە؟

# مۆسیقا

ئـەی مۆسـیقا پـێم نالێیـت تـۆ چـیت؟ تـۆ سـروودی سروشـتی یـان بەستەی گەردوونی؟ من نـازانم تـۆ چـیت، هـەر ئەوەنـدە دەزانم ئاوازێـك دەڕژێتە گوێمەوەو یەکسەر بە هەموو ئەندامەکانی لەشمدا دەگـەڕێت لـە تـەوقی سـەرمەوە دەسـت پێـدەکاتو لـە کەڵەموسـتی پێمـەوە دەچـێتە دەرەوە، ئاوازێك بـە گوێمـدا دەدەیـت دەمـارم لـە خۆشـیدا سـڕدەکاتو دەمخاتە سەر شەپۆلی تەزووی خـۆش خـۆش. بەخـەیاڵی خـۆم لـە تاڵـە ناسکەکانی ئەو ئاوازە قالیچـەیەك دەچـنم تـانوپۆی هـەموو سـۆزو لـەرە بێـت ئینجـا هـەر بـە خـەیاڵ سـواری ئـەو قالیچـەیە دەبمو دەمبـاتو دەمبات...

ئەی مۆسیقا تۆ جریوەو جوکەی بولبولی، کە گیان دەسمێتـو خـوێن دەمژێت[1].یان هاوارو هـاژەی کـەف چـوڕینی چـەمیت کـە لای لایـەی[2]. خەمە بۆ تەنیایی شەو.

---

(١) گۆران لە (بۆ بولبول) دا دەڵێت:

چۆن توخوا چۆن ئەی بولبول

ئەی باڵداری بەهرە زل

ئەو گەروو بچکۆلانە

ئەو نەغمە بەرزو جوانە

چۆن دێتەدەر، چۆن ئەرژێ

وا گیان ئەسمێ، خوێن ئەمژێ

(٢) گۆران لە گەشتی هەوراماندا دەڵێت:

هاوارو هاژەی کەف چوڕینی چەم        بۆ تەنیایی شەو، لایە لایەی خەم

ئەی مۆسیقا: تۆ ئەو لای لایەیت، کە دایك بۆ کۆرپە ساواکەی دەکات یا لاواندنەوەی کیژۆڵەیەکیت لەسەر گۆڕی کاکی کوژراوی؟ تۆ ئەو دەنگەیت کە لە تکەی دڵۆپە ئاوەوە بەرزدەبێتەوە یان ئەو نوزەیەی کە سنگی مرۆڤی بە ئاستەم نوزەتیاماوەوە دێیتە دەرەوە؟ تۆ هۆرەی جافیت یا لاوكو حەیرانی؟ تۆ تەوژمی بەستەی حەسەن زیرەکیت یان سۆزی خالقیت؟ بۆ دەنگی تاق تاق کەرەیت یان قاسپە قاسپی کەویت؟ تۆ دەهۆڵو زورنای ڕۆژی جەژنی نەورۆزیت یان سۆزی شمشماڵەکەی دەروێش عەبدوڵایت[1]؟ تۆ زەردەخەنەی منداڵیت یان تریقەی پێکەنینی خێزانێکی بەختیاریت؟ تۆ شەقەی داری کێو کەژەکانیت یان هۆهۆی جوتیاری پێدەشتەکانیت؟ دە پێم بڵێ ئەی مۆسیقا تۆ چیت؟ تۆ چیت؟

دەڵێن ڕۆژێك کاکەی شوان ڕانە مەڕەکەی برد بۆ لەوەڕ، لەو سەرەوە درەنگی لێکردو شەو داهات، ناچار بوو لە دۆڵێکدا لای جۆگەو ئاوێك، کە خوارەکەی قامیشەڵان بوو مەڕەکەی مۆڵداو خۆشی لەولاوە پاڵی لێدایەوە، گوێی هەڵخست دنیای زۆر کپو بێدەنگ هاتە بەرچاو، ئەوەندەی پێنەچوو شنەبایەکی خۆش لەسەردا هاتو بەناو دۆڵەکەدا کشاو چوو بە گەرووی قامیشەکانداو ئاوازێکی سەیری لێبەرزبووەوە، کاکەی شوان بە دڵ حەزی دەکرد گوێی لێبگرێت، بۆیە بۆ بەیانی

---

(١)درەوێش عەبدولا شمشاڵ ژەنێکی هەڵکەوتوو بوو، گۆرانی شاعیر شیعرێکی بۆ وتووە دەڵێت:

بە ڕەنگی زەردو شێوەی دەستو کزا، دەروێش

حەزمکرد بەستەیەك ببەم سەراسەر حوزنو ماتەم بێ

لە سیماتا بەدیم کرد هەیکەلی عومرێکی حەسرت کێش

وەها دیارە کە بەختت ئاشیانی بولبولی خەم بێ...

بەرزبوووەوە، کاکەی شوان بە دڵ حەزی دەکرد گوێی لێبگرێت، بۆیە بەیانی هەستا چوو قامیشێکی بڕیو چەند کونێکی تێکردو فوی پیادەکرد، ئەوە یەکەم ئالەتی مۆسیقا بوو.

ئەی مۆسیقا تۆ دڵی ڕەق نەرم دەکەیت، دڕندەماڵیدەکەیتو بێچووەکانی دەهێنێتە هەڵپەرکێو سەما، مار کە گوێی لە دەنگی تۆ بێتو ملی قووت دەکاتەوەو خۆی دەلەنجێنێت.

ئەی مۆسیقا تۆ چیت؟ تۆ گڤەی باڕەشی شەوانی تۆفی زستانی کوێستانەکانیت یان سروەی بای هاوینی گەرمیانیت، تۆ گیزەی گوللەی ئازادی خواهانی یان ترپەی پێی کوڕ کاڵانی، ئەی مۆسیقا تۆ هەموو ئەمانەو لەمانەش گەلێك زیاتریت.

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتا |
|---|---|---|
| قاڵیچە | : | مافورك |
| دەسمێت | : | دەسمت |
| ئاوارە | : | دەربەدەر، پەناهەندە. |
| تەوژم | : | گوڕ |
| تاق تاق کەرە | : | جۆرە باڵدارێکە لە شەودا خەوتن لە هەناسەدانەوەدا دەنگێك دەردەبڕێت کە وەك (تاق تاق) وایە |
| قامیشەلان | : | ئەو شوێنەیە کە لەڤەنی لێ شیندەبێت. |

## گفتوگۆ:

١. هیچ کاتێك مۆسیقا کاری تێکردوویت؟

٢. چ دەنگێك لە ژیانتا وەك مۆسیقاو ئاوازی خۆش وابووە بەلاتەوە.

٣. یەکەم ئالەتی مۆسیقا چۆن دۆزراوەتەوە؟

٤. بۆچی میسریەکان نەقشی ئالەتی مۆسیقایان لەسەر دیوار هەڵکەندووە؟

## چۆن دەخوێنیتەوەو چی دەخوێنیتەوە؟

هیـوادارین ئێسـتا بـە تـەواوی فێـری ئـەوە بووبێـت، کـە بێـدەنگ بخوێنێتەوەو دیسان هیوادارین کە فێری ئەو نەریتە نەبوویبت، کـە لێـوت بجوڵێنیت لە کاتی خوێندنەوەداو ورتەورتی بۆ بکەیت، چـونکە بەڕاسـتی نەریتێکی خراپەو هەرچی زەوق هەیە تێیدا نییە، نـەک هـەر ئـەوە بـەڵکو دەبێتە کۆسپ لە ڕێگای خوێندنەوەی خێراداو دواتـدەخات، کـەوابوو تـۆ ئێستا هەر بەچاو دەخوێنیتەوە، وشە بە وشە ناخوێنیتەوە بـەڵکو برگـە بە برگـە دەخوێنیتـەوەو هـیچ ناوەسـتی مەگـەر لـە بڕگەیەکدا کـە بـاش تێینەگـەیت. ئـــەم جـــۆرە خوێندنەوەیـــە بەڕاســـتی خوێندنـــەوەی خوێندەواران‌و تێگەیشتووانە، چونکە ئەگەر وانەکەن لەبەر ئـیش‌و کـاری زۆریان، فریانەکەون ئەوەی دەیانەوێت بیخوێننەوە.

بەڕاسـتی خوێندنـەوە خۆشـی‌و چـێژی زۆرە چـونکە خوێندنـەوە دەرگای شارەزایی وامان بۆ دەخاتە سەر گازی پشـت، کـە لـەوەو پـێش نـەک هـەر بیرمـان لێنەکردۆتـەوە بـەڵکو بـە خەیاڵیشـماندا نـەهاتووە. خوێندنەوە یەک جـۆر نییـە، هەیـە چـیرۆک‌و ڕازە، هەیـە شـیعری ڕازاوەو کاریگـەرە، هەیـە لـە بیروبـاوەر دەدوێـت، هەیـە باسـی مێـژوو دەکـات‌و دەدەوێت، دیسانەوە کتێب هەیـە باسـی میللـەتانی جیهـان دەکـات، کـە خوێندومانەوە تێدەگەین، کـە لـە جیهانـدا هـەر ئێمـە نـین بـەڵکو گـەلێک میللەت هەیەو هەر یەکەش وەک ئێمە ئاوات‌و ئامانجی خۆی هەیە.

جیهانی خوێندنـەوەو کتێـب جیهـانێکی فـراوانو بـێ سنورە. تـۆ لـە خوێندنەوەدا پێویستیت بە یارمەتی هاوڕێکانت هەیـە بـۆ ئـەوەی کتێبـی باشت بۆ هەڵبژێریت بۆ خوێندنەوە، هاوڕێکانت زۆریان پێخۆشـە کـە لـەم بارەیەوە یارمەتیت بدەن، دیارە تۆش پێت خۆشە، کە یارمـەتیی ئـەوان بدەیت. بەڵام کە وردەوردە لـە خوێندنـەوەدا پێشـکەوتیت ئـیتر هـەر لـە خۆتــەوە ســەیردەکەیت، کــە پێویســتیت بــە کــەس نییــە کتێبــت بــۆ هەڵبژێرێت بۆ خوێندنەوەی، چونکە خۆت ئەو نووسەرانە دەناسـیت، کـە نووسینەکانت بە دڵە.

مرۆڤــی خوێنــدەوار هــەموو جــۆرە کتێبێــك دەخوێنێتــەوە تەنانــەت ئەوانەش کە ناوەڕۆکەکانیان هیچو پوچ بـن، ئەگـەر گووتـت باشـە تـۆ چ سوودێکت وەرگرت لە خوێندنەوەی ئەم کتێبە ناوەرۆك پوچـە؟ یەکسـەر وەڵامت دەداتەوە، دەڵێت سوودی ئەوەم وەرگرت، کە تێگەیشـتم هـیچو پووچە؟

ئەوانەی کە کتێبی هەڵبژێراویان دەدەنـێ بـۆ خوێندنـەوە وەکـو ئـەو گـەدە نەخۆشـانە وان، کـە خواردەمـەنی هەڵبـژێراویان دەدەنـێ چـونکە گەدەی ساخو دروست هەموو جۆرە خواردنێك دەهاڕێتو هەرسـیدەکاتو شتە بە کەڵکەکانی بۆ لەش لێ هەڵدەگرێت هـەروەها خـاوەنی مێشـکێکی ڕونـاکیش هــەموو جــۆرە کتێبێــك دەخوێنێتــەوەو چــی بــە کــەڵك بێــت وەرپدەگرێت.

ڕۆژێك لاوێکی تازە پێگەیشـتوو لـە (مـازنی)ی نووسـەری بـەناوبانگی عەرەبی پرسی، کە ڕێگای پیشانبدات بـۆ ئـەوەی ببێـت بـە نووسـەرێکی

گەورەی وەکو ئەو، (مارنی)ی لە وەڵامدا وتی: (تەنیا یەك ڕێگا دەزانم، ئەویش ئەوەیە کە هەمیشە بخوێنیتەوە).

ئەوانەی هەمیشە بەردەوام نەبن لە خوێندنەوەدا وردەوردە ڕێزو قەدریان لای خەڵك کەم دەبێتەوە، چونکە جیهانو زانستو وێژەو بیروباوەر هەمیشە لە گۆڕانو تازەبوونەوەدان. ئەوەی ئێستا بەڕاستی دەزانیت چەند ساڵێکی تر وا دەرناچێت، ئەگەر پێ بە پێی ئەم گۆڕانە نەڕۆیتو لە کاروانی پێشکەوتنو تازەبوونەوە دوابکەویت گاڵتەت پێدەکەن دەڵێن ئەمە مێشکی بەستوویەتیو هیچ وەرناگرێتو شان بەشانی پێشکەوتن ناڕوات. دیارە خوێندنەوەی کتێبو گۆڤاری نوێ باشترین ڕێگایە بۆ ئەوەی شان بەشانی پێشکەوتن بڕۆیتو دوانەکەویت. ڕەنگە بڵێیت من ئێستا لە پۆلی هەشتەمی بنەڕەتیمو لە کوێ پێمدەکرێت لە ئێستاوە کتێبو گۆڤاری نوێ بخوێنمەوە، بەڵام با بەڕاستی پێت بڵێین ئەگەر ئێستا دەست پێنەکەیتو نەتوانیت، کە گەورە بوویتو چوویتە ساڵیشەوە هەر ناتوانیت.

لە کتێبی خوێندنەوەی عەرەبی،

پۆلی دووەمی ناوەندییەوە وەرگیراوە

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| | | |
|---|---|---|
| ورتەورت | : | منجە منج |
| کۆسپ | : | ئاستەنگ |
| چێژ | : | تام |

## گفتوگۆ:

١. بۆچی چێژ لە خوێندنەوە وەردەگرین؟

٢. (مازنی)ی چیی بەلاوە تازە پێگەیشتووەکە وت؟

٣. بۆچی ئەوانەی ناخوێننەوە، قەدرو ڕێزیان لای خەڵك نامێنێت؟

٤. چۆن دەتوانیت شان بەشانی پێشکەوتنو گۆڕانو تازەبوونەوە بڕۆین؟

٥. بۆچی وا باشە کە بەچاو بخوێنینەوە نەك بە لێو؟

## ئەشكەوتی شانەدەر

كوردستان وڵاتێكی شاخاوی‌و سەختەو شاخەكانیشی گەلێك كون‌و كەلەبەرو دەربەندو ئەشكەوتی تیادایە، كە هەریەكەیان شایەتی ئەوەن، كە لە زۆر كۆنەوە لەم وڵاتەدا ئینسانی تێدا ژیاوەو پەناوی بۆ ئەو ئەشكەوت‌و كەلەبەرانە بردووە، لەوانە ئەشكەوتی (هەزارمێرد) نزیك سولەیمانی‌و ئەشكەوتی شانەدەر یا شانیدەر لە برادۆست‌و گەلێكی تر.

دێی شانەدەر، كە لە دەشتێكی تەسكی زورگاوی دایەو (٢٦)كم لە پردی خەلانی سەر زێی خەلان كە لقێكە لە زێی گەورەو (٤٣)كم لە شارۆچكەی خەلیفانەوە دوورە ئەشكەوتی بەناوبانگی (شانەدەر)ی[1]. لێیە لە قەد شاخی (برادۆست) كە (٢١٠٠) پێ لە ڕووی دەریاوە بەرزە. لەبەر سەختی شوێنەكەی تا ئێستا ڕێگای ئوتۆمبێلی نییە، بەڵام مرۆڤ بە پێ یا بە وڵاخ بە (٤٠) دەقیقە لە بنی شاخەكەوە دەگاتە ئەشكەوتەكە، كە (٩٠٠)پێ بەرزە.

دەمی ئەشكەوتەكە بەرەو باشوورە، لەبەر ئەوە هەتاو دەیگرێتەوە بە تایبەتی لە زستاندا، شوێنەكەی‌و بوونی ئاو تیایداو نزیكیی لە ڕوبارو زێوە وای لێكردووە، كە لە سوورە بەردینەكانی كۆنەوە شوێنی ئینسانی كۆن بێت‌و تێدا ژیابێت. ئەم ئەشكەوتە گەورەترین ئەشكەوتە، كە لە ژووری وڵاتدا. ئەشكەوتەكە شێوەیەكی سێ سوچی هەیە پانی دەمەكەی

---

(١) مامۆستای بەرێز تكایە سەیری لاپەرەی (٢١) گۆڤاری (ڕۆژی كوردستان)ی ژمارە (٣، ٤)ی ساڵی (١٩٧١) بكە.

(٨٢ ) پێیەو بەرزیشی (٢٦) پێیە، لە ناوەوە پانییەکەی دەگاتـە (١٧٥) پێ، لە ناوەراستیدا بەرزییەکەی دەگاتـە (٤٥) پـێو نزیکـەی (١٣٠) پـێ قوڵـەو تـەواو دەبێـت، ئەگـەر چـی لـەم دواییـەدا لـە سـاڵی(١٩٦٠) ز دەرکەوت، کە دوای ئـەو قوڵییـەی شـوێن دەمێکـی داخـراو هەیـە، بـەڵام هێشتا دەربارەی ئەمـە پشـکنینی تـەواو نـەکراوە. سـەرەتای پشـکنینو گـەڕان لـەم ئەشـکەوتەدا لـە سـاڵی(١٩٥١)ز بـۆ ماوەیـەکی کـەم لەلایـەن بەڕێوەبـەری گشـتی دێرینـەوە دەسـتیپێکرد، دوای ئەمـە (ئامۆژگایـەکی ئـەمریکایی) بـە سـەرۆکایەتی (ڕالـف سـەلیکی) بەشـێوەیەکی پچڕپچـڕ دەستیکرد بە گەڕانو پشکنین، لە ئەنجامی لێکۆڵینـەوەی خـاکی زەوی ئەشـکەوتەکە بۆیـان دەرکـەوت، کـە لـەم ئەشـکەوتەدا لـە زۆر کۆنـەوە مرۆڤـی تێـدا ژیـاوە، چـونکە ئـەو بـەردو کەلوپـەلو ئێسـکو چڵوچـێوی مرۆڤانەی لەوێدا دۆزرایـەوەو بـە پێـی چینی زەوییەکـە، کـە کردیـان بـە چوار بەشەوە دەرکەوت، کە لەبەشی یەکەمـدا دۆزراوەکـان دەگەڕێنـەوە بۆ (٧٠٠٠) ساڵ پێش ئێستا، لەبەشی دووەمدا بۆ (١٢٠٠٠) ساڵ و لە ژێر چینی دووەمدا بۆ (١٧٠٠٠) ساڵ مرۆڤی تێدا نـەژیاوە و لـە (٢٩٠٠٠) سـاڵ تا (٣٤٠٠٠) ساڵ، کە سێیەم چینە خۆڵەمیشو کەلوپـەلی بـەردینی وەکـو هینی دەوری بەردینی زۆر کۆن وایە، کە پێیدەڵێن (ئۆرکینشـی)و چـینی چوارەم بۆ (٤٥٠٠٠ تا ٧٠٠٠٠) ساڵ پەیکەری ئێسکی مرۆڤی کە بە مرۆڤی (نیاندرتاڵ) بەناوبانگە دۆزرایەوە لەگەڵ پەیکـەری ئێسـکی منـداڵێك، کـە هـی نیاندرتاڵـە، ئـەم جـۆرە ئینسـانە زۆر جیایـە لـە ئینسـانی سـوڕە نزیکـەکان، وێنـەی کـۆنترین ئینسـانە، کـە لەعێراقـدا تـا ئێسـتا

دۆزراوەتەوە، جگە لەمانە گەلێك گژوگیاو ڕووەكو گوڵی ئەو دەورانەی تیادا دۆزرایەوە، كە زۆریان تا ئێستا لەسەر شاخەكانی زاگرۆسی كوردستان هەنو سەوز دەبن.

كەواتە دەبێت بزانین كە ئەشكەوتی شانەدەر پارێزگاری پاشماوەو پەیكەری هەر كۆنترین مرۆڤە، كە ئەمەش ئەوە دەردەخات، كە لە زۆر كۆنەوە وڵاتی كوردستان ژیانو مرۆڤی تێدا بووەو پەنای بۆ شاخو ئەشكەوتەكانی بردووە، كەواتە تۆش بەڕێزەوە تەماشای بكە.

## ڕاڤەكردنی پەیڤەكان

| پەیڤ | : | واتاكەی |
|---|---|---|
| ئەشكەوت | : | ئەشكەفت |
| دەربەند | : | گەلی |
| تەسك | : | تەنگ |
| زورگاوی | : | دەشتێكی پڕ لەبەرزیو نزمیو گردو تەپۆلكە |
| باشوور | : | خواروو |
| سور | : | دەور، چاخ |
| سێ سووچ | : | سێگۆشە |
| پشكنین | : | گەڕانو جستوجۆ |
| ئامۆژگا | : | خوێندنگە، پەیمانگە |
| پچڕ پچڕ | : | متقطع |
| پەیكەری ئێسك | : | هێسكە پەیكەر |
| بەردین | : | بەردی |

## گفتوگۆ:

١. بۆچی ئینسانی کۆن خۆی بۆ ئەشکەوت کوتاوە؟

٢. ئەشکەوتی شانەدەر دەکەوێتە کێوە؟

٣. ئەو شتانەی لە شانەدەر دۆزراونەتەوە چین؟ وە چی دەردەخەن؟

٤. ئینسانی (نیاندرتاڵ) چ جۆرە ئینسانێك بووە؟ لە کوێ دۆزراوەتەوە؟

٥. ناوی چەند ئەشکەوتێك بڵێ، کە لە وڵاتەکەتا هەیە؟

# ئەدیسۆن

## ١٨٤٧- ١٩٣١ز

ئـەم نـاوداره لـە سـاڵی ١٨٤٧- ١٩٣١ز لـە وڵاتـە یـەكگرتووەكانی ئەمریكادا لە شاری (میلان ئۆهایۆ) هاتۆتـە دنیـاوه بـاوكو دایكـی هـەژار بوون، خۆشی مرۆڤێكی لاوازو پەڕپووت بووه، لـە خوێندنـدا زۆر بێكـەڵك بووه، تەنانەت رۆژێك مامۆستاكەی گەیشـتە تینـی پێـی دەڵێـت: (نـازانم باوكو دایكی تۆ چییان لە تۆدا بینیوه وا تۆیان خسـتۆتە بـەر خوێنـدنو هیچـیش فێرنابیـت). ئـەم قسـەیە زۆر كـار لـە ئەدیسـۆن دەكـات و دەگەڕێتەوه بـۆ لای دایكـیو قسـەكەی بـۆ دەگێڕیتـەوه، دایكیشـی دڵـی دەداتـەوەو دڵنـەوایی دەكـاتو بـە دڵ بـە تـەواوی دەسـتدەداتە بـاڵی كوڕەكەی، لە سایەی دایكییەوه بوو بە ئەدیسۆن، كە لە هـەموو جیهانـدا ناوی دەركرد، هەر لەبەر ئەمە بوو كە سـەروبنی زمـانی گشـت ئـەوەبوو، كە دەیگووت (دایكم منی پێگەیاندووه).

لە تەمەنی یازده ساڵیدا دەستی دایە كیمیاگـەری، لـەم سـەردەمەیدا دەستكورتی تەنگی پێهەڵچنی بـە بـاوكو دایكـی گـوت، كـە رێیبـدەن بـۆ ئەوەی ئیشـبكات، ئەوانیش رێیاندا، ئینجا دەستیكرد بە رۆژنامـەو میـوه فرۆشتن، لێرەدا تۆزێ بوژایەوەو لە دەست هەژاری كەمێك رزگاربوو.

جارێـك كـوڕێكی كـارگوزاری شـەمەندەفەر لەوانـەبوو ببێـت بـەژێر شەمەندەفەرەكەوه، ئەدیسۆن رزگـاریكرد، بـاوكی كوڕەكـە لـە پاداشـتی ئـەم ئیشـەدا ئەدیسـۆنی فێـری تـەلگراف كـرد. ئەدیسـۆن لـە ژوورێكـی شـەمەندەفەرەكەدا خـەریكی كیمیاگـەری دەبێـت، شوشـە فسـفۆرێك

دەکـەوێتو ژوورەکـە دەسـووتێت، چـاودێری شـەمەندەفەرەکە زللەیـەك دەکێشـێت بـە بنـا گوێیـدا، لـە ئـەنجامی ئـەوەوە ئەدیسـۆن تـا مـا هـەر کەڕبوو.

لــە شــازدە ســاڵیدا لــە تەلگرافخانــەی (ســتراتفۆرد) دامــەزرا بــە مانگانەیەکی کەم، لێرە بەدواوە بە ڕۆژ بە کیمیاگەریو بەشەو بە ئیشـی تەلگرافەوە خەریك دەبوو، بەڵام لە ئیشی تەلگرافخانەیەکدا هـەر چـەندە گەلێك خزمەتی شایانی پێشاندا لەگەڵ ئەوەشـدا هـەر لەسـەر ئیشـەکەی نەیان هێشتو دەریانکرد، لە تەمەنی بیسـتو یـەك سـاڵیدا داهێنراوێکـی تری داهێنا، لە بیستو دوو ساڵیدا لە شاری (نیویـۆرك) دەسـتکورتی بـە تەواوی شپرزەیکرد بە ناچاری چووە لای (میستەرلو) بۆ نان پەیداکردن، ئەم میستەر لوە سەرۆکی ئـەو هاوبەشـییە بـوو، کـە دەنگوباسـی نرخـی بەسەر بازرگانو گەورەکاندا بڵاودەکردەوە، هاوبەشـی لـە پاداشـی ئـەو چاکەیەدا مانگانەکـەی بـۆ کـرد بـە شەسـت لـیرە، ئـیتر لێـرە بـە دوواوە ئەدیسۆن کە کاروبـاری ڕوویکـردە چـاکە بـە تـەواوی چـووە ژێـر ئـەرکی داهێنانــەوە، داهێنراوەکــانی ئەدیســۆن زۆر زۆرن بــەڵام بــە کــەڵکترینی هــــەموویان (چــــرای ئەلــــەکتریك، بزوێنــــەری ئەلــــەکتریك، ســــینەماو گرامافۆن)ن.

ئەم پیاوە پایە بەرزە لەماوەی (٨٤) ساڵی تەمەنیدا گـەلێك خزمـەتی بەرز بەرزی بەرانبەر بەمرۆڤایـەتی نوانـد، ژیـانی ئـادەمیزادی سـەردەمی خـۆیو دوای خـۆی بـەهۆی بەرهەمـە داهێنراوەکانیـەوە لـە تاریکییـەوە گەیانــدە ڕونــاکی، بــەهۆی ڕەوشــتە جوانەکــەیو بــەهۆی داهێنــراوە

جوانەکانییەوە بوو بە یەکێك لە گەورە پیاوانی سەردەمی خۆیو دوای خۆی.

چەند خۆش بوو بۆگێتی ئەو دەمە، کە لە تەمەنی هەشتا ساڵی ئەدیسۆندا سێ سەد کەس لە زاناو داهێنەرانی ئەوروپاو ئەمریکا لەماڵی ئەودا کۆبوونەوە بۆ ئاهەنگێرانی جەژنی لەدایکبوونی، کەچی هەر لەو کاتەدا، وەکو منداڵێکی ساوا دەستیکرد بە پێکەنینو میوانی بەجێهێشتو ڕایکردەوە بۆ ناو کارگەکەی خۆی. زۆر دڵی بەو سوپاسنامەیە خۆش بوو، کە (تۆڵستۆی) بۆی نارد، کاتێك کە گرامافۆنی داهێنا، دانەیەکی بەناوی دیارییەوە بۆ تۆلستۆی نارد سەیرتر ئەوەبوو ئەدیسۆن لەگەڵ ئەم هەموو زرنگیو ئازایەتییەدا سەری لە پولو پارەو ژماردنو شتی دیکەدا دەرنەدەچوو... لە گوزەرانو ڕابواردندا شلو شێواو و کەمتەرخەم بوو، لەگەڵ ئەوەدا کە کارگەو خانوەکەی بەدەم یەکەوە بوون گەلێك جاری وا هەبوو، چەند شەو و چەند ڕۆژ نەدەچووە ماڵەوە؟ کە کۆچی دوایکرد لەسەرتا سەری وڵاتی ئەمریکا دا، تا چەند تاوێك گشت چرا ئەلەکتریکەکان کوژێنرانەوە، ئەمەش لەبەر نەمری ئەدیسۆن بوو، ئەو ئەدیسۆنە، کە بەهۆی داهێنراوەکانیەوە چرای ناوی خۆی ڕوناککردەوە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| ناودار | : | ب ناڤ و دەنگ |
| هاتۆتە دنیاوە | : | لەدایکبووە |
| هەژار | : | خەزان، ژار، ڕەبەن |
| مرۆڤ | : | ئادەمیزاد |
| لاواز | : | بێهێز |
| پەرپوت | : | بێکەڵك، هەژار |
| فێرنابێت | : | هیم نابەت، نا عەلمێت |
| دەگەڕێتەوە | : | دزڤرێ، ڤەدگەڕێ |
| دڵیدەداتەوە | : | دڵخۆشیدەداتەوە، دڵنەوایدەکات، |
| دەستکورتی | : | هەژاری |
| تەنگی پێهەڵچنی | : | هاتەسەری، تەنگاویکرد |
| میوە | : | فێکی، فێقی |
| بوژایەوە | : | ژیایەوە |
| شایان | : | هێژا |
| پەکی کەوت | : | لەپەلو پۆ کەوت، توانای نەما |
| منداڵی ساوا | : | بچوکێد ساڤا |

## گفتوگۆ:

١. چی دەربارەی ژیانی (ئەدیسۆن) فێربوویت؟

٢. ناوی چەند داهێنانو داهێنەری تر بنووسە.

٣. لە چیرۆکی ژیانی ئەدیسۆن چی فێربوویتو چ پەندێکت وەرگرت؟

٤. دۆزینەوەی هێزی ئەلەکتریك (کارەبا)ی چی داهێنانی تری لەدوا هات؟

## یەکی ئایار

گۆرانییەکی کوردی هەیە دەڵێت ( بەهار مانگی نیسانە) هەر ئەو سترانە کوردییە لە بەهارو نیساندا باسی گوڵو گوڵزارو مێرغوزار دەکات. هەر بەدوای نیسان با بڵێین لە مایسدا دیسان باسی خۆشیو گوڵو سەیران دەکرێت، بەڵکو لە ڕۆژانی دوایی نیساندا هەموو شارێکی سەر ئەم زەمینە خۆی بۆ ڕۆژی یەکی مایس ئامادەدەکات.

ئێستا یەکی مایس لە هەموو جیهاندا جەژنە، شاییە، خۆشییە، میهرەجانی هەمە ڕەنگە، جەژنی کرێکارانی جیهانە جەژنی هەموو کەسو دەستەو چینانەی کۆمەڵە، کە باوەڕیان بە چینی کرێکار هەیە، ئەو چینە بە توانا، بازووهەڵکراوە بە ڕابەڕی گەلان دەزانن، کاروانی خەباتو ژیانو بنیادنانی دوارۆژی پڕ لە شادومانیو بەختیاریو پێشکەوتنو شارستانیەتی مرۆڤایەتین.

**بەڵام چۆن یەکی ئایار بووە بە جەژنی کرێکارانی جیهان؟**

کە دێینە سەر ئەم باسە دەبێت چیرۆکێکی مێژوویی پڕخوێنی چینی کرێکاری بگێڕینەوە. چیرۆکی ئەم کارەساتەی بوو بە شادی، ئەو شینو ماتەمەی بە جەژن، ئەو زوڵمو خوێن ڕشتنەی شەفەقێکی نوێی ئازادیو سەرکەوتنو خەباتی لێ هاتە ئارا.

لە ساڵی (١٨٨٦ )ی زاینیدا لە شاری (شیکاگۆ) لە ئەمریکا کرێکارانی کارگەی (میکرنیک) بڕیاریاندا مانبگرنو ئیش نەکەنو بەو ڕێگەیەدا داوای بەشێك لە هەقی زەوتکراوی خۆیان بکەن. داوای زیادکردنی کرێو باشکردنی شێوەی ژیانو شوێنی ئیشکردنی خۆیان

دەکرد. سەرمایەدارە مفتخۆرە- خوێنمژە- ڕەنجخۆرەکان، ئەمەیان بەدڵ نەبوو، نەیاندەویست دان بە مافی کرێکاران دابنێن، دەست لە بەشێك لەو قازانجەی خۆیان هەڵگرن، کە هەمووی بەری ڕەنجی کریکارەو هەقی کرێکارەو ئەوان دەیخۆن.

کاتێك کە سەرمایەدار بە گورزو گوللەو ئاسنو بەندیخانە بەربەستی خەباتی کرێکارانی پێناکرێت، پەنا دەباتە بەر فڕوفێڵ. هەر بەم جۆرە، نا پیاوانە لەگەڵ کرێکارانی شیکاگۆدا جوڵانەوە، بە فێل بانگیانکردن بۆ وتووێژ، هەر لەو شوێنەدا، کە کرێکاریان تیا کۆکردبووەوە. بەکرێگیراوێکی خۆیان هێنابوو. بەرگی کرێکاریان کردبووە بەر ئەو بەکرێگیراوە، دەستی لەو پۆلیسانە کردەوە کە وەستابوون، دەمانچەیەکی نا بۆ پۆلیسێکەوە، بەمە بیانوو کەوتە دەست پۆلیس، بۆ ئەوەی تەقە لە کرێکاران بکەن، گەلێکیان لێبکوژنو لەدوایدا گەلێکیشیان لێبکەن بە داراو مان وگرتنو خەباتی کرێکارانیش بەدناو بکەن. بەڵام زۆری نەخایاند، کە ڕاستی دەرکەوت، دەستی سەرمایەداران کەوتەڕوو، فروفێڵی ئەوان خۆیان بوو.

دادگای پڕدادی مرۆڤایەتی ئەوانی تاوانبار کردو کرێکارانی شیکاگۆی بە بێ تاوان دانا. ئیتر هەر لەو کاتەوە کۆنگرەیەکی کرێکاران داوایکرد، کە هەموو کرێکارانی جیهان ڕۆژی یەکی مایس بە ڕۆژی خۆیان بزانن، ڕۆژی خەباتی کرێکار، ڕۆژی دەرکەوتنی هەقی کرێکارو پاکیو سەر ڕاستی چینی کرێکار، ئەو ڕۆژەی بە خوێنی پاکی، بە ناهەق ڕژاوی

کرێکـارانی شـیکاگۆ ڕاسـتییەك لـە ڕاسـتییەکانی ئـەم سـەردەمەی تێدادەرکەوت، ڕاستیی مافو کۆڵنەدانو ڕابەرایی چینی کرێکار.

بەدوای کرێکارانی ئەمەریکا زۆر وڵات، ئەم ڕۆژەیان بە جەژنی خۆیان دانا ئەم ڕۆژەیان کرد بە نیشانە بۆ یادکردنـەوەی شـەهیدانی شـیکاگۆ و هـەموو خەباتکـەرانی ئـەو چـینە ڕابـەرە. ئـەم ڕۆژە بـوو بـە نیشـانەی تێکۆشـانی کرێکـارانو هاوسـوێندەکانیان بـوو بـە جـەژنی سـەرکەوتنی کارگەرانو زەحمەت کێشان.

ڕۆژ دوای ڕۆژو ساڵ دوای سـاڵ لەگـەڵ سـەرکەوتنە تازەکـانی چـینی کرێکـار، وڵاتـانی تـازە ئـەم ڕۆژەیـان بـە جـەژن ناسـی و کردیـان بـە پشوودان، لـە وڵاتـی ئێمەشـدا دەمێکـە کرێکـاران یـەکی مـایس بـە ڕۆژو جەژنی خۆیان دەزانن. کاتێـك کـە ڕژێمـی کۆنەپەرستی پاشـایەتی بـاڵی ڕەشی بەسەر وڵاتدا کێشـابوو، کرێکـاران بەدزییـەوە ئاهـەنگی جـەژنیان دەگێڕا. بەڵام لە چواردەی تەمووزی(١٩٥٨)دا ئەو ڕژێمە سەرەو بن کـرا، یەکی مایس بـە جـەژن دانـراو کـرا بـە یـەکێك لـەو ڕۆژانـەی پشـوی تێـدا دەدرێت.

لـە یـەکی ئایـاردا کرێکـارانی عێراقـیش، ئاهـەنگ دەگێـڕن، جـەژن دەکەن، بازووی هەڵماڵراو پیشاندەدەنو نیشانەی یەکێتی ڕیـزو خـەباتی خۆیان دەردەخەن، یادی شەهیدانی کاروانی خـەباتیان دەکەنـەوە، بـەم چەشنە دەنگی ئایارو زەنگی کاروانی کارگەران گەیشتە خاکی ئێمەش،

هەروەك شاعیرێکی کورد دەڵێت:

**هەر چەند دێوە ورگنەکان**

**بەری تەقەلاچنەکان**

**بە فێڵو فڕ**

**کوژانیانەوە کڵپەی ئاگر**

**بەڵام ڕۆژی ئایاری سوور**

**شەماڵ ناوی فڕان بۆ دوور**

**بوو بە چرا**

**ئایار بوو بە پشتو برا**

کەواتە دەبێت ئێمەش لە ڕۆژی یەکی ئایاردا، هەموومان لەگەڵ چینی کرێکاری وڵاتەکەمان جەژن بکەینو ئاڵای خەباتی سەرکەوتن هەڵبکەینو سرودی ئەو چینە ڕابەرەو ئەو ڕۆژە بەرزە بخوێنینەوە هەر لەگەڵ هەموو شاعیرانی شۆرشگێرو ئەو شاعیرەدا ببێژین:

**بۆیە ئایار**

**نەك هەر دەرگای جەور شکێنە**

**وەك ڕۆژی شەوگاری تار**

**دوایی بەزۆداران هێنە**

**ساتۆ ئەی ئایاری ڕەنگین**

**جەژنی گشت ئازادی خواهانی**

**بۆ پێش خستنی گیانو ژین**

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | | واتاکەی |
|---|---|---|
| گۆرانی | : | ستران |
| سەر زەوی | : | جیهان، گێتی، دنیا |
| ئامادە دەکات | : | حازر دەکات |
| شاییی | : | **شاهی، داوەت، سویر (سوور)، زەماوەند، گۆڤەند** |
| بەتوانا | : | خورت، بەهێز |
| بازوو هەڵکراو | : | بازوو فەتلی، دەست هەڵگرتی. |
| کاروان | : | کارڤان |
| بنیادنان | : | دامەزراندن، هیم دانان، دانیاندن، بنەڕەت دانان |
| لێ هەڵهات | : | ژێ ڤەبوو |
| هەڵگرن | : | ڕاکەن |
| بە گورز | : | ب گوپال، بەزۆر |
| بەربەستی | : | بەرگری، ڕێ گرتن |
| فێل | : | خاپاندن |
| بانگیانکردن | : | گازیانکردن، گازیێ واکر |
| وتووێژ | : | گفتوگۆ، گاڵ گاڵی |
| کۆکردنەوە | : | کۆمکربوو، گردی کردبۆوە |
| وەستابوون | : | سەکنیبوون، ڕاوەستان |
| دەمانچە | : | تەبانچە، شەش دەرب |
| بیانو | : | بەهانە، حوجەت (عەرەبی)، هەنجەت، بیانگە |
| لێبکوژن | : | ژوان بکوژن |
| زۆری نەخایاند | : | گەلێك ل دویڤ نەچوو، زۆری پێ نەچوو |
| خۆیا بوو | : | ئاشکرا بوو، دەرکەوت |
| تاوانبار | : | گوناهبار |
| یادکردنەوە | : | بیرکردنەوە، هزرکردن، بیرانین |

| | | |
|---|---|---|
| دەمێکە | : | گاڤێکە، بێهنێکە، ژمێژڤە |
| ورگن | : | سك زل |

| | | |
|---|---|---|
| تەقەلا | : | هەول، خەبتین، کۆشش |
| گوژاندیانەوە | : | ڤەمراندن، تەمراندن |
| کلّپە | : | گڕ، گوڕی، گڕە |
| تار | : | تاری، تاریك |
| خوێناوی | : | خوێنین، ب خوێن |

**گفتوگۆ:**

١. لە یەکی ئایاردا چ هەستێك دەکەیت؟

٢. ئایا دەزانیت ئەو چەند دێرە شیعرە هی کێن و لەکام دیواندا بلاّوکراونەتەوە، بیری لێبکەنەوە ئەگەر نەتزانی سەیری ئەم چەند دێرە بکە بەدوای دیوانەکەدا بگەڕێ:

( ئەمە چەند دێرە لەهۆنراوە– یەکی ئایاری– شاعیرێك کە زۆرتر بەناوی (ع.ح.ب) ەوە شیعری لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بلاّو کردۆتەوە، خۆی ناوی (محمد شێخ حوسەین بەرزنجییە) سالّی (١٩٢٣)، لە بەرزنجە لەدایك بووە، سالّی (١٩٣١) هاتۆتە سلێمانیو تا ئێستا لەوێ دەژیت. دیوانە چاپکراوەکەی ناوی (ناسۆرەی دەروون) ەوە دیوانێکی چاپکراوی هەیە).

٣. ئایا شیعری هیچ شاعیرێکی تر دەربارەی یەکی ئایار دەزانیت؟

٤. دە دێر لەم بارەیەوە بنووسە: (چینی کرێکار پێشرەوی پێشکەوتنو سەرکەوتنی ئاواتی مرۆڤایەتییە)

## هەڵەبجەی شەهید

هەڵەبجە شارێکی جوانو خنجیلانەی کوردستانە، کەوتۆتە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری سولەیمانییەوە، لەنێو باوەشی زنجیرە چیا سەرکەشەکانی هەورامانو شنرویێو باڵاجۆ دایە، بە دیمەنی سروشتیو چاو ئەندازەی ڕەنگین ئاوی زۆری سازگار، زەویی بەپیت، زۆری بەرهەمو میوەجات، دارستانی چڕ، فێنکی ئاو و هەوا، کانگای ئاسنو گۆگردو گەچ بەناوبانگە، شارێکی زۆر کۆنە مێژووەکەی بەستراوەتەوە بە مێژووی شارەزوورو میرنشینی بابانەوە، لەسەردەمی عوسمانییەکاندا بنکەو بارەگایەکی گرنگی لەشکری ئەوان بوو، لە ناوچەی هەڵەبجەدا گەلێك گردی شوێنەوارو وێنەو نیگاری جۆراو جۆر دەبینرێ، کە مێژووەکەیان بۆ سەردەمی ئاشوریەکانو میدییەکان دەگەڕێتەوە.

هەر لە کۆنەوە هەڵەبجەو ناوچەکانی دەوروبەری مەڵبەندی خوێندنو زانست بوون، شوێنی مامۆستایانو زانایانی پایە بەرزی ئایینی بوون. لە بواری ئەدەبیاتدا شاری هەڵەبجە، وەکو ئەستێرەیەکی گەشی پڕشنگدار لە ئاسمانی کوردستان گەشاوەتەوە، گەلێك لە شاعیرە ناودارەکانی کورد لەم ناوچەیە پەروەردە بوونو پێگەیشتوون (مەولەوی، وەلی دێوانە، تاهیر بەگی جاف، گۆران، ئەحمەد موختار جاف، کاردۆخیو...).

هەڵەبجەی شیرین هەمیشە بنکەی ڕاپەڕینو شۆڕش بووە، داڵدەو پەنای شۆڕەسوارو شۆڕشگێڕان بووە. چقڵی چاوی ناحەزان بووە، بۆیە هەر لە دێر زەمانەوە دوژمنانو داگیرکەرانی کوردستان ڕقو کینەیان

بەرامبەر ئەو ناوچەیە نواندووەو هێرشی درندانەیان بردۆتە سەر. ئینگلیزەکان لە ساڵەکانی دوای جەنگی یەکەمی جیهاندا لە سەردەمی شۆڕشی (شێخ مەحمود)ی نەمردا بە چەند فڕۆکەیەك شاری (هەڵەبجە)و (عەبابەیلێ)یان بوردمانکردو کۆمەڵێك خەڵکی بێتاوانیان شەهیدکرد. هەروەها شاری هەڵەبجە لە ڕۆژی ١٩٧٤/٤/٢٦ز کەوتە بەر هێرشی ئاسمانی فڕۆکەکانی ڕژێمی بەعسی هاوکات لەگەڵ بۆردومانکردنی شاری قەلادزێی خوێناویدا، خەڵکێکی زۆر شەهیدو برینداربوون.

لە بەهاری ساڵی (١٩٨٨)ز کە شەڕی عیراق‌و ئێران لە ئارادابوو، ئێرانییەکان لەشکری عیراقیان تێکشکاندو ناوچەکانی هەڵەبجەو خورماڵ‌و بیارەیان داگیرکرد، ئەم ڕووداوە بووە ڕێخۆشکەرێك بۆ دەسەڵاتدارانی ڕژێم‌و تۆڵەی لەشکرە بەزیوەکەی لە خەڵکی بێدەسەڵات کردەوە، ڕق‌و کینەی دڵی ڕەشی بە کورد هەڵڕشت، ئەوەبوو لە (١٩٨٨/٣/١٦)ز بە درندەترین شێوە بە چەکی کیمیاوی پەلاماری شاری هەڵەبجەو دەوروبەریدا، بەربووە گیانی خەڵکی بێتاوان، هەزاران منداڵ‌و ژن‌و پیاو و لاوی تازەپێگەیشتووی لە کۆڵان‌و شەقامەکانی شاری هەڵەبجەدا لە گەورەترین ڕووداوەکانی مێژوودا شەهیدکرد هەزارەهای تریشی ئاوارەکرد، ئەم کارە بێویژدانەی ڕژێم لەم سەردەمەدا بێ وێنەیەو زۆر درندانەتر بوو لە کردەوەی نازییەکان.

ئەم کارەساتە دڵتەزێنە لە کاتێکدا ڕوویدا، کە تازە بەهار بوو. دەشت‌و دۆڵ‌و قەدپاڵی شاخەکانی بەرگی سەوزییان پۆشیبوو، چرۆی درەختەکان پشکووتوو بوون، گوڵ‌و گوڵاڵەو بەیبون‌و وەنەوشەو چنور

دەست لەملانە لە یەك ئـالآبوونو ناوچـەكەیان خەملآنـدبوو. دانیشـتوانی ناوچەكە چـاوەڕوانی سـەیرانو گەشـت بـوون. خۆیـان ئامـادەكردبوو بـۆ جەژنی نەورۆز، بەلآم بەداخەوە لە جیاتی بۆنی گوڵو گوڵاڵە جوانـەكانو ئاهەنگو خۆشی هەوری نیگبـەت ئاسمـانی هەڵەبجـەی شـیرینی داگـرتو (خەردەل)ی باراند، هەزاران مـرۆڤ و باڵنـدەو مـەرومالآتی قڕكـردو بوونـە قوربانی ستەمی بەعسی خوێنڕێژ.

كیمیابـارانی شـاری هەڵەبجـەی ڕەنگـین كارەسـاتێكی تراژیـدی بـوو، دەبوو ویژدانی سەرانسەری جیهان بۆی بهـەژێت، چـاوی هـەموو مرۆڤێـك فرمێسكی خوێنینی بۆ بڕێـژێت، بـەلآم بەداخـەوە حوكومەتـەكانی دونیـا بگرە گەلەكانیش بەرامبەر ئەم كارەساتە بێدەنگ بوون لەبەر بەرژوەندی خۆیـان، لـەكاتی خۆیـدا بـە هانـای گەلـە ستەم لێكراوەكـەمان نـەهاتن، گوێیــان لــە هــاوارو ناڵــەی لێقــەوماوان نــەگرت، یارمــەتیی برینــدارو ئاوارەكانیان نەدا، پشتیوانیان لـە مـافی مرۆڤـی كـورد نـەكرد، دەنگیـان بەرامبەر تاونباران بەرزنـەكردەوەو ڕیسـوایان نـەكردن. گەرچـی هەنـدێك بێزاری دەربڕین هەبوو، بەشێوەی تاكو تەرا، بەلآم لە ئاسـتی پێویسـتدا نەبوون.

هەڵەبجەی شیرین تۆ بوویت بە هاوەڵی (هیرۆشیما) و (ناكـازاكی) تـۆ بڵێی ئەو ستەمەی لێیانكردیت وا بە ئاسانی لەیاد بكرێت؟ نەخێر هەرگیز چاوەڕوانی ئەمە مەبە، برینێكی قوڵەو وەها زوو سارێژ نابێت، هەتا كورد مابێت لە یادت ناكات، نەوە لەدوای نەوە بە یەكتری دەگەیێنن، كە كورد بە هەناسەكێشان شەهیدبووە.

ئەم کارەساتە گەورەیەو خاپوورکردنی گوندو شارۆچکەکان، زەبرو زەنگی بێ سنوری ڕژێمو ئەنفالو هەموو جۆرە ئەشکەنجەکانی تر، بلیسەی ئاگری شۆڕشی کوردیان خۆشترکرد، ورەو توانای خەڵك بەهێزتربوو، گوڵی هیوا گەشتر بوو، ڕیزەکانی هێزە نیشتمانپەروەرەکان پتەوتر بوو، هێزی گەل هاتە مەیدانو وەکو بورکانێك تەقییەوە لە ڕاپەرینە مەزنە شکۆدارەکەی ئاداری (١٩٩١)ز خۆی نواند، دامودەزگە داپلۆسێنەرەکانی ڕژێمیان تێکشکاندو کوردستان ڕزگار بوو، پەرلەمانو حکومەتی کوردستان هاتە کایەوەو دوای ئەم سەرکەوتنە مەزنە بە خۆشی تەباییەوە، بەهێزی بازووی لەبن نەهاتووی گەلەکەمان، بە پەنجەی هاوکاری شاری هەڵەبجەی شەهید ئاوەدانکرایەوە، ئاوارەکانو لێقەومان بەزێدی باوكو باپیرانیان شادبوونەوە، ئێستاش گەلی کورد هەموو ساڵێك لە یادی ئەم کارەساتەدا کە شانزەی ئادارە سەری ڕێزو نەوازش بۆ گیانی پاکی شەهیدان دادەنوێنێتو چەپکە گوڵ لەسەر گۆڕیان دادەنێت، سۆزو پەیمان تازە دەکاتەوە، کە بەردەوام دەبێت لە خەباتو تێکۆشاندا بۆ پاراستنی دەستکەوتەکانو بەدەستهێنانی هەموو مافە ڕەواکانی گەلەکەمان، هەوڵدەدات ڕەگ وڕیشەی ناکۆکیو تۆوی دووبەرەکی هەڵبکێشێت، بە یەك دڵو یەك مەبەست لە پێناوی دوارۆژی نەتەوەکەمانو چارەنووسی تێکۆشێت.

# ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | واتاکەی |
|---|---|
| شار | بازێر |
| چیا سەرکەشەکان | چیا بڵندەکان، چیایێن بلندو سەرکەش |
| چاوئەندازە | دیمەن |
| گۆگرد | کبریت |
| داڵدە | پەناگە، پەسێو، شوێنی خۆشاردنەوە، جهێ خۆشارتنێ |
| چقڵ | درك، ستری، زی |
| لە ئارادابوو | لە گۆڕێ بوو، لەبیرو هزران بوو، لە بەیندابوو |
| قڕکرد | لەناویبرد، نەهێلا، ژناڤبر |
| بۆی بهەژێت | بێتە هەژیان، بۆی بجووڵێ |
| ڕیسوایان نەکردن | ئابڕوویان نەبردن |
| ستەم | زوڵمو زۆرداری |
| خاپوورکردن | تێکدانو ڕماندن، کاولکردن |
| شکۆدار | گەورەو مەزنو پڕ بەها |
| ڕژێمە داپلۆسێنەرەکان | ڕژێمێن تیرۆرست، سەرکۆتکەر |

## شۆڕشی مەزنی ئەیلوولی ١٩٦١

گەلی کورد خاوەنی نیشتمانێکی فراوانو بەپیتە، هەزاران ساڵە ئەو گەلە لەسەر ئەم خاکەدا، کە زێدی باپیرانیەتی نیشتەجێیە، دوژمنان هەمیشە چاویان لە سامانی ئەو خاکە بووە، لەبەر ئەوە دڕندانەو نامرۆڤانە هێرشو پەلاماریان هێناوەتە سەرو بە زەبری چەكو هێز داگیریان کردووە، ئیمپریالیزمی تازەش چونکە پشتگیری لە ستەمو زۆرداری دەکات، بۆیە لە دوای جەنگی گەورەی یەکەمەوە بوو بە پاڵپشت بۆ دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانو نیشتمانی کوردی بە سەریاندا دابەشکرد. کوردستان بوو بە چوار لەتو هەر لەتێکی درا بە دەوڵەتێك، ئەو ستەمەی لە گەلی کورد کرا، لەکەیەکی ڕەش بوو لە نێو چاوانی مرۆڤایەتی، ئەو لەکەیەش لاناچێت تا ئەو گەلە ستەمدیدە بە هەموو مافێکی ڕەوای خۆی نەگات بە مافی چارەنووسیشەوە.

بەشێکی گەلی کورد دابەشکراو بەبەر عیراق کەوت، ئەو بەشەی دەیان ساڵو بگرە پتریش، کەوتە هەوڵو تێکۆشانو ڕێی خەباتی سەختی گرتە بەر بۆ بەدەست خستنی کەمترین مافی ڕەوای، بەڵام بەداخەوە حکومەتە یەك لەدوا یەکەکانی عیراق گوێیان بە خواستو ویستی کوردی عیراق نەدەدا، لەبەر ئەوە هەموو جارێك ئاگرو ئاسن بۆ کپکردنی کڵپەی شۆڕش بەکاردەهات.

شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ز لە عیراقو سەرنگونکردنی ڕژێمی پاشایەتی گڕوتینی بەبەر بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلەکەمان ناو ئاسۆی لەبەر دەم کوردی عیراق ڕوناککردەوە، کوردی عیراق ماوەیەك هەناسەی

ئازادی تەناهی هەڵکێشا، بەڵام لە ڕێ لادانی شۆڕش هەموو ئاواتەکانی تێبرد، دەسەڵاتدارانی شۆرشی تەمموز لە هەموو بەڵێنەکانیان پاشگەزبوونەوەو کەوتنە گیانی ڕۆڵەکانی ئەم گەلە، بە ناچاری کورد دەستی دایە چەکی بەرگریکردنو پشت قایم بە چیا سەرکەشەکانو بە بیروباوەڕی پتەوی کوردایەتی شۆڕشی ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١ز هەڵگیرساند، نەك لەبەر ئەوەی کورد حەزی لە کوشتو کوشتارە، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو، کە ناچارکرا ئەم ڕێگایە بگرێتە بەر بۆ بەرگریکردن لە بوونو مافی خۆی. تا دەهات ئاگری شۆڕشی بە گوڕتر دەبوو، دەیان هەزار پێشمەرگەی بە جەرگو بازوو پۆلایین لە کەژو کێوەکانی کوردستاندا بڵاوبونەوە، گرمەی تۆپو گڕەی فڕۆکەو ویزەی گوللە ببوونە سیمفونیای سەردەم، ئەو ڕۆژگارە بوو بە شەوگارو تەمومژی ڕەشی جەنگ باڵی بەسەر کوردستاندا کێشا، دەیان داستانی ئازایەتیو قارەمانیەتی تۆمارکرا، چەند جارێك حکومەتی عیراق بە ناچاری شەڕی ڕاگرتو داوا گفتوگۆی دەکرد، هەموو جارێکیش گەلی کوردە، سەرکردایەتییەکەی بەدەم ئەم داوایەوە دەهاتن، چونکە کورد شەرخواز نییە، بەڵکو ئاشتی خوازو مرۆڤ دۆستە. دواجار گفتوگۆ درێژەی کێشا، دانووستان بەردەوام بوو، تا لە دواییدا بەیانی (١١)ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ز دەرچوو، کە تیایدا بۆ یەکەم جار حکومەت دانی بە مافی خۆڕێبەرێتی کورد نا، ئاگری شۆڕشی تا ماوەیێك کپ بوو، گرمەی تۆپو گڕەی فڕۆکەکان نەمانو لە جێی ئەوان سازو دەنگی دەهۆڵو زوڕنای کوردەواری لە دۆڵو نیهالەکاندا دەنگی دەدایەوە، لولەی تفەنگو

تۆپـەکان توانـەوەو کـران بـە گاسـنو پێمـەڕەو بێـلٚو بـۆ زەوی کـێڵانو ئاوەدانکردنەوە، بەڵام ئەو بارودۆخە زۆری نەخایاند، حکومەتی عێراق لە هەموو بەڵێنو بڕیارەکانی پاشگەز بووەوە، پشـتی لـە کـورد کـردو ڕووی لە کۆمەڵێك هەڵپەرسـتو مرۆڤـی ناشایسـتە کـرد، لەبـەر ئـەوە شۆڕشـی کورد ناچار بوو دووبارە تێهەڵچێتەوەو لە هـەموو لایـەك ئـاگری شۆڕشـی کڵپە بکاتەوە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیف | : | واتاکەی |
|---|---|---|
| زێد | : | نیشتمان، وەلات |
| پاڵپشت | : | پشتیوان، پشتەڤان |
| لەت | : | پارچە |
| نێوچەوان | : | هەنیە، ئەنی |
| ستەمدیدە | : | زوڵم لێکراو، زولم لێکری |
| کپکردن | : | دامرکاندن، ڤەمراندن، ڤەتمراندن. |
| کڵپەی شۆرش | : | گوڕیێ شۆرشی |
| پاشگەزبوونەوە | : | پەشیمان بوونەوە |
| شەوگار | : | شەڤێ درێژو تاری |
| هەڵپەرست | : | مرۆڤی ئینتهازی |

## خێزانێکی ئاوارە

ئەو ساڵە هاتێکی باش بوو، وەرزێران هەر یەکە بە ئارەزووی خۆی تەلی ئامانجی بۆ مەبەستەك لێدەدا، کە چەند ساڵێك بوو چاوەنواڕی هاتێکی وا بوون، جگە لەو کەسانە نەبێت، کە بە تەواوی باری ئاڵۆزاوی وڵاتیان دەزانیو دوژمنانی گەلیان چاك ناسیبوو، بە هێماکردنی بێگانان هەڵدەسوڕێن بە پێچەوانەی بەرژەوەندی ئەم کۆمەڵگە تێکۆشەرەن، بۆیە بە پیرۆزترین شت سوێندیان خوارد، تا دوا هەناسەو دوا دڵۆپ خوێن وزەو تین بخەنە بەر لاشەیان دژی داگیرکەران بجەنگنو کۆڵنەدەن گەمە بە پڕۆژەی زندە بەچاڵیان بکەن.

چەرخی گەردوون سوڕایەوە بە سەر چارەنووسی میللەتدا، دوژمن بە یاریدەی ناپاکان هێرشێکی نارەوای فرە چەشنەی هێنایە سەر ناوچەکە و جوتیارو زەحمەتکێشان کەوتنە بەرگری لەشکری ستەمکاران، ئەوەی سەد ساڵ بوو یەکتری نەویستبوو، لەم شەرە ئابڕوومەندانەیەدا یەکتریان گرت بۆ پاراستنی نیشتمانو ناوچەکەیان، لە دوژمنیان کردە ئاگرباران، شێرانە هاواریان دەکرد:

بژی ئازادی، بژی کوردستان.

دۆستانو برادەرانی گیانی بەگیانی، ئەم بەوی دیکەی دەگوت: ها... قوربانە، قوربانی کوڕان بم، مردن یا سەرکەوتنو زاڵبوون بەسەر دوژمنی کەودەنی...

باوکی پشت کۆماوەی، بە ساڵا چووی گوپاڵ لە دەست بە تاقانەکەی دەگوت: "کوڕم، لە بابتە، مەردانە شەڕکە، دوژمن ببەزێنە،

بەرخی نێر لۆ سەربرین باشە، با دایكو خوشكەكانتان بە دیلی نەكەونە دەست ناپاكان... "لاوە جەمەدانی لەسەرەكان بە گەرووی هیشكو تێنوو دەیان نەڕاند: با گوللەتان ئاراستەی كەللەی دوژمن بكرێتو یەك لەدوای یەك بیان پێكێت، با ئەم خاكە بێت بە گۆڕستانی نەیارو دوژمنانو ببن بە پەندی ڕۆژگار، نەعرتەو قیژەی دایكو خوشكانی كوندە لە پاشۆڵ دەچووە كەشكەشانی فەلەك، تەرمی دوژمنیان دەكرد بە سپێرو، بەناو لورەی تۆپو تەقەی برنۆو قرەی تەنتریۆف، یەك ڕكێب خۆیان دەگەیاندە لەشكرە جەنگاوەرەكانیان، كە بە شەستیرو قۆنداغ بە گڕی ماهوزەرو كچكچاپ دەجەنگان. هەر چەندە لە سەرەتا سەركەوتنێكی ئێجگار گەورەیان نواند، بەڵام نەمانی فیشەكو سروشتی ناوچەكەو لەشكری نەپساوەی دوژمن ئابلۆقەیان دانو لە دەوریان ورینو كەتنە سووتنو تاڵانو كوشتنو بڕینی بێتاوان... ئەمەو جگە لە گوارە لە گوێی ژنان داپچڕندنو سووتانو ئاگر تێبەردنی هیشكو تەڕی پاش تاڵانكردنەكە، لە لۆریان كەوتنە كێشانەوەی پیرو پەككەوتووی خواناسەكانی مزگەوت، ماڵو منداڵانی دەست نەكەوتووش چەنی خێزانی خانە پاشا ئاسایی وەك كۆترە باریكە پەڕاگەندەو دەربەدەرو لانە لێ تێكچوو! پلكە (ستی)ش یەكێك بوو لەوانەی لەم شەڕەدا لەبەری پەرێز منداڵەكانی (باپیر)ی كوڕی پەسارە دابوون دەربازی كردبوون نەی خستبوونە دەست هێرش هێنەرەكان لە گوندێكی خۆفرۆشەكانی نێزیكیان، لای ناساوێكیان، كە بەناو سەر بە ئەوان بوو، ستارەیگرت، پاش گرتنی (نازداری)ی بووكی لە جیاتی باپیری كوڕی، لەگەڵ چەند

ژنێکی تری گوندەکە درانە دەست زەفتیەکە کەس لە ئاخاوتنیان نەدەگەیشت، لەم ڕۆژەوە دونیا بە یەکجاری لە داپیرە ستی وێکهات، پەژارە دایگرت، کە چۆن لە بەر چ ئایین و بڕوایەك ئافرەتی بێتاوان بخرێتە بەندیخانە، چونکە پیاوەکەی نادات بە دەستەوە؟! باشە، کێ دەڵێت کوڕەکەی ئێستا بە گیان ماوە؟ هەموو دەم وەکو مەنجەڵی شیری بەهار دەکوڵا، فرمێسکی بە گوڕی دەهاتە خوار بەتایبەتی کە وێنەی باپیری دەهاتەوە بەر چاو، کە لەڕەوەزە شاخێکی سەخت بریندار بووەو مەرگ باوەشی بۆ کردووتەوە. دەك، جەرگی داکی خراپێ، چۆن لەسەرە مەرگا بەو دەستی فرچکی پێ دایێ قومەك ئاوی نەدایێ!!.

ئێوارەیەکیان مەنجەڵی چێشتەکەی لەسەر سێ کوچکە بچکۆڵانەکەدا تا دەهات پتر جۆشی دەستاند، ئاگری سەرگین و قشپل لەسەر یەك کەڵەکەیان دەکرد، هەوای هۆدە ڕەش و دوکەڵاوییە بێ کولانکەکەیان گەرم داهێنابوو، جار جارە شیشەیەکی تری دەخستە بن مەنجەڵە ڕۆخ پسایەکە بەدەستی ڕاستیش لانکی کوڕەزای دەهەژاند... (چەتۆ)یان کۆخە لە هۆرو دۆرخۆی بردبوو، سەری خستبووە سەر ڕانی چەپی داپیرەی کە هەردەم لەبەر ئازاری باداری درێژی کردبوو، جار نا جارە نوزەیەکی (دایە مردم) لە برسانی لێوە دەهات. (بێرێ) خوشکە گەورەی منداڵان لەوبەری ئاگردانەکەوە، وەکو گوڵێکی ژاکاو و ئاو لێبڕاو زەردو سیس هەڵگەڕابوو، جلك و بەرگێکی شڕووڕی پۆشیبوو. ناشکوری نەبێت بەرگی پەرێز، داوە دەزویەکت ڕابکێشایە سەد پینە دەکەوتە خوارێ،

لەبرسانا کەوانەی کردبوو، چاوە گەلاوێژییە تێکچووەکانی بڕیبووە شۆربای پیرخەنی. لایێک (دایە شیو)، لایێک (دایە نان)، جگە لە واقەواقی ناو لانکەکە، ئەمانە تێکەڵ بە هوڕینەو سەردوولکەی داپیرەی زامداری ڕۆژانی بەسەرچوویی دەبوونو نەخشەی کارەساتێکی ڕەشبینیو ماتەمیی ترسناکیان دەکێشا، بۆیە یادگارەکانی ڕابردووی وەك شریتی شانۆ دەهاتەوە بەرچاو بە دەنگێکی پڕ لە قوڵپی گریانەوە دەکەوتە لای لایەی ساواکەو بە ئاوازێکی تێکەڵاو دەیگووت:

**لای لایێ ڕۆڵەی من لای لایێ کۆرپەکەی دایێ لۆ خەوت نایێ؟!**

**بابی بێ سەرت هیچ دەنگی نایێ خودای هەژاران بە هانام نایێ**

**سووتامو برژام لۆ خەوت نایێ؟!**

لە پڕ یەکێك زۆر لەسەرخۆ، بێ خشپەو خرپە بە ئاستەم:

- داپیرە، لە ماڵێی؟!

(چەتۆ)و (بێری) جولەیان تێکەوتو بووژانەوە!

- کێیە، جەرگی داپیرەی؟

- میوانی ڕادەگرن؟

- ڕۆڵە، بفەرموون، میوان ئازیزە، سەر لە مەیدانێیە یان ماڵ؟!

(پیرۆت) مامۆستای گوند: سەلامو عەلێك

- وە عەلەیکە سەلام،... ئای مامۆستایە، کچێ بێری، لە داکتە، لبادەکەی لۆ مامۆستای بێنە.

لباد شرپ بە عەردی دادراو تۆز ژوورەکەی پڕکرد.

مامۆستا گازی چەتۆی کردو ماچێکی لێکردو سێوەکانی هێنابووی لە کۆشی دانا، پورە ستی پاش بەخێرهاتنی گەرم گوڕ، هەندێ بلێی یەکو دوو شیوەکەی تێکردو یەکو نانیشی لەبەردەم دانان، ئەوان خەریکی خواردنو ئەمانیش کەوتنە دواندنی یەکتر.

پلکە ستی: ئەرێ، بە قوربانت بم، چ دەنگوباسی خۆشت پێ نییە؟ بە مەرقەدی حوسێنی غازی، لە عەزمەتی نازداری داکی مندالآن وەختە شەق بەم! گیان لە جێیەکی قەیمە نایەتە دەرێ! ! با خۆفرۆشانو دوژمنان دەست خۆیان بوەشێنن، بەو ئالقەی لە مالّی خوای ڕام هژاندییە... با...با پـ پـ پیر بێتەوە، شیری ئەم مەمکانەی لێ حەرامدەکەم، بەنوێژی نیوەڕانێ نەیانداتە بەر گوللەی ئەو پڕنۆیەی کە بەنانی مندالآن کڕایە!...

مامۆستا: داپیرە، هەموومان (باپیر)ین، کوڕە گچکەی تۆین، ڕۆژەك دێت لەبەر چاوی تۆ دەدرێنە دادگای گەلو سزای تاوانی خۆیان دەدرێتەوە، ئەوە میللەتە– میللەت، لە پۆلا قایمترە، لە دەریای بێ بن فراوانترە، فریزە هەر بیبڕە شین دەبێتەوە! دەلّێن لەشکری ئێمە سەرکەوتن، لەدوای سەرکەوتن وەردەگرن، هەر بزانە مزگێنی ڕزگاریت لۆ هات.

هێشتا وتەکەی لە دەم مابوو بیلێ هەردوو لا ڕوومەتی ماچکرد:

– وەی داپیرەی ڕەقو هیشك لەسەرت گەرێ، (نازدار) لە بەندیخانە دێتەوە؟ لەگەلّ (باپیر) لۆ ناو مالّو مندالّیان بەسەر بلّندی؟!

وەی خوایە دەروویەکمان لێبکەوە، حە خۆ... مەرگی داپیرەی لۆ کوڕە جاحێرە خۆ نەفرۆشەکان بێ...

- داپیرە، من درەنگ مە، ئەو( پێنج) دینارە بگرە، چ پێویستیت هەیە، پێی بکڕە، ئەو( سێ) دینارەش بدە (سێوێ) بەڵام مەڵێ (مامۆستا) ناردیتی، چونکە ئافرەتێکی دەم پەلە...
- ئای مامۆستا، کەی ئەو چاکانەت بدەمەوە؟

مامۆستا هەڵسا سەرپێیان، نا داپیرە، ئەمە هی میللەتە، کە بەشانازییەوە بۆ ئێوەی دەنێرن (باپیر) لۆ میللەت خۆی کردووتە قۆچی قوربانی. لەسەرخۆ، دوعابوونی خواستو چووە دەرەوە.

سپێدەی بەیان دەرکەوت، پلکە ستی خۆی گەیاندە ماڵی سێوێ:

- ها، ئەوە سێ دینار لۆیان ناردووی.
- هەبی نەبی، کێ ناردیتی؟
- نەم ناسی.
- مامۆستا پیرۆت نەبی، هاموو شۆی پێشتر لەگەڵتان هەبوو؟

لە ژنانم گوێ لێبوو، دەڵێن زۆر باشە.

ستی گوتی: نا هەونیەو، گەڕایەوە.

سێوێ چووە ناو کۆڕی ژنان دانیشتو وتی:

- بەخوا خوشکینە مامۆستا پیرۆت ئەم شەو حەفت دیناری لۆ ناردووم، بچم هەندێ ترێ بکڕم، زۆرم حەز لێیە، بەخوا بابی کەسارو لێقەوماوانە.

هەر ئەو دەمە دەنگ بە سەرۆکی خۆفرۆشەکان ڕاگەیی‌و ئاگاداری سازمانی دوژمن کراو مامۆستایان تێك لولداو خستیانە ناو پیکەپە کەسکەکەو بۆ شاریان برد، لەوێ پاش سێ شەو و سێ ڕۆژ لێدان دارکاریکردن، بۆ ئەوەی ناوی ئەو کەسانە بلێت کە لایەنگیری شۆڕشگێڕەکانن‌و جوێنیان پێ بدات.

بەڵام ئەم مەردانە وەستاو پێیوتن:

من هەر دەکوژن، بەڵام لە تۆڵەی من هەزارانتان لێدەکوژرێت!

پاش ماوەیەك شەڕ ڕاگیراو پێشمەرگە قارەمانەکان بەرەو خێزانەکانیان گەڕانەوە، هەر یەکە منداڵ لە باوەشی، خۆشی شادی سەرتاپای نیشتمانی گرتەوە، (بێری)و (چەتۆ)ش لە دەرگای حەوشە، هەر دەمە بۆ لایەك غاریان دەداو (سەرکەوت)یش بە گاگۆڵە دوایان دەکەوت، چاویان دەگێڕا لە چ لایەك بابیان دەربکەوێت، بەڵام بەداخەوە دەمێك بوو نیشتمانی خۆشەویست لەناو گۆڕا باوەشێنی لێدەکرد!

# بەردە قارەمان

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا سوری کیشوەری عوسمانی بەرەو لێژی دەڕۆیشت، هەر کاتە نا کاتێك ئاژاوەو هەرایەك بەرپاردەبوو، چونکە ستەمو زۆرداریی عوسمانییەکان لە سنور دەرچووبوو، لە لایەکی تریش دەنگی زەنگی باوەڕی نەتەوایەتی بەرەبەرە لە ولاّتاندا دەزرینگایەوەو گەلانی ژێر دەستی ئاگادار دەکردەوە، ئەو گەلانەی کە لەژێر دەسەلاّتی ڕژێمی نالەباری عوسمانییەکان دەتلانەوە، ئاواتە خوازبوون، کە ڕۆژێك بێت ڕزگار ببن لەو بارە ناسۆرەی کە تێدا دەژیان.

کوردیش یەکێك بوو لەو گەلانەی کە هەناسەبڕکەی پێکەوتبوو لەژێر فەرمانی تورکەکانو، هەمیشە ئاواتی دەخواست کە بلێسەی ڕوناکیو ئازادی بەسەر خاکی کوردستاندا هەڵبێت.

هەروەها لە ساڵی(١٩١٤)ز کارەساتی جەنگی گێتیی یەکەم هەلگیرساو وێنەی سامناکی وردەوردە شاباڵی ڕەشی بەسەر هەموو قوژبنێکی جیهاندا کێشاو هەموو لایەیکی شلەژاندو لە ئەنجامی ئەم جەنگە خوێناوییەدا چەرخی گەردوون ئینگلیزی بەسەرکەوتوویی گەیاندە خاکی دلێران، کە کوردستانە.

ئەو تافیش (شێخ مەحمود) پایەکی بەرزی هەبوو لەنێو کورد، چ لە ڕووی ئاینەوەو چ لە ڕووی نیشتمانپەروەرییەوە، دەیویست کوردستان سەربەخۆ بێتو شێخ مەحمود لەم بارە ئاڵۆزاوەی کۆڵییەوەو وای بە باش زانی کە ئینگلیزەکان ئاگادار بکات، کە ئەم خاکە نیشتمانی

کوردەو دەبێت بۆ کورد بێت، لەبەر ئەمە نامەیەکی بۆ نوێنـەری ئینگلیـز نارد، کە لە بەغدا بوو، لە نامەکەدا وتبووی:

"سەدەهای ساڵە ئەم خاکە مەڵبەنـدی کـوردە، هیـواداریـن کـە ئێـوە مافمـان بـدەنو مـاوەی ئـەوە نـەدەن کـە بەچـەك داوای مـافی خۆمـان بکەین."

ئینگلیزەکان ئەمەیان سەلماندو گوتیـان ئێمـە مـافی کـورد دەدەیـن، ئینجـا لـە سـەر ئـەم پەیمانـە نوێنـەری ئینگلیـز (مێجـەر نوئێـل) بـەبێ تەگەرەو ئاستەنگ گەیشتە سولەیمانیو بۆ ڕۆژی دوایـی لەبـەر دەرگـای (سەرای سولەیمانی) لە پێش چاوی هەزاران دانیشتوانی شار چووە سـەر کورسیەك گوتی:

"بـە نـاوی مـیری بـەریتانیا وەك حـاکمی گشـتی عـیراق پێتـان ڕادەگـەیێنم، کـە ئێـوە لـە یەخسـیریو دیلیـەتی ڕزگـاربوون، ئـیتر سەربەستو ئازادنو شێخ مەحمود حوکمداری کوردستانە."

لە پەرۆشی ئەم موژدە خۆشـە، گـەلی کـورد وەکـو گـوڵ گەشـایەوەو شـاری هەڵمـەتو قوربـانی بـوو بەپارچـەیەك لـە بەهەشـتی بـەرین، وەلێ هـەزار مخـابن! ئـەم خۆشـیو شـادییە زۆری نەخایانـد!! چـونکە ئینگلیزەکان لە کامی دڵیانەوە بڕوایان بە مـافی کـورد نـەبوو، بـەڵکو بـۆ خۆ چەسپاندن ئەم گفتەیان دابوو!!.

بـەم جـۆرە بـە تـەواوەتی لـە قسـەی خۆیـان پاشـگەزبوونەوەو دەستیانکرد بەهێنانی بێگانە بۆ کوردستان، لە هەندەرانەوەو تەفرەدانی هەندێك کـورد، ئـا بـەم چەشـنە بـاری کوردسـتان ڕۆژ بـەرۆژ تـا دەهـات

ئالۆزتر دەبوو، هەتا وای لێهات شێخ لە خۆی وەڕسبوو، لە وزەی نەما کە باری وڵات بەم جۆرە بڕوات.

ئەمجا نامەیەکی توندو تیژی بۆ حاکمی گشتی عیراق ناردو داوای جێبەجێکردنی پەیمانەکەی کرد، کە سەربەخۆیی کوردە، بەڵام ئەم داخوازییەش بێ سود بوو، چونکە ئینگلیز بە تەواوی پەشیمان بووەوە لەو گفتەی کە دایبوو. ئینجا شێخ دەستیکرد بە خۆ ئامادەکردن بۆ دەرکردنی بێگانە لە خاکی کوردستاندا، ئیتر ئاگری جەنگ هەڵگیرساو سوارەو پیادەکانی کورد وەکو پڵنگ لە هەموو لایەکدا هەڵمەتیان دەبردە سەر سپێرەکانی دوژمن، بەڕاستی کارێکی ئەوتۆیان بە ئوردوگای ئەوان کرد، کە با بەدەواری شڕی نەکردبێت! کە (تاسلوجە) بوو بە گۆڕستانی سوپای لیڤی ئینگلیز.

دوای ئەم سەرکەوتنە مەزنە سوپای کورد لە ژێر فەرماندەیی سەرکردەی حوکمداری کوردستان بەرەو کەرکوك کەوتنە ڕێو لە (دەربەندی بازیان) بارەگای خۆیان دامەزراند، هەروەها ئینگلیزەکانیش دەستیانکرد بە هێنانی هێزێکی زۆر لە موسڵەوە بۆ کەرکوك، ئینجا ئەم هێزە بەرەو بازیان بزوت.

بەم چەشنە کاتێك لەناکاو لەگەڵ سپێدەی بەیاندا سوپای ئینگلیز لە چەند لایەکەوە هێرشی بردە سەر جەنگاوەرە دلێرەکانی کورد بە کوشندەترین چەك، لە زەوی‌و لە ئاسماندا.

سوپای کوردیش وەکو شێر بەرەنگاریان بوون‌و جەنگێکی مەردانەیان کرد، هەتا وای لێهات ڕیزی پێشەوەی سوپای کورد دەست

بە خەنجەر پەلاماری دوژمنیان داو کەوتنە ناویان، ئیتر هەر ئەوە بوو، کە هیچیان بە زیندوویی نەگەڕانەوەو پاش شەڕێکی بێوچان شێخ مەحمود زامدار بوو، لە ئاکامی ئەم جەنگە خوێناوییەدا سوپای کورد شکاو دوژمن هاتە نێو بارەگاکەیانو شێخیان بە برینداری لەبن بەردەکە ناسییەوە، بە یەخسیری بردیان بۆ بەغداو جەنگ کۆتایی هات.

ئەو بەردەی کە بوو بوو بە سەنگەرێك بۆ پاراستنی شێخ مەحمود لەکاتی جەنگدا ناویان لێنا (بەردە قارەمان) ئەمەش دەکەوێتە خوارووی کلکەی دەربەند، ئینجا ناوی ئەم بەردە پەخش بووەوەو بوو بە وێردی سەر زمانی هەموو نیشتمانپەروەرێکی کورد، ناوی پیرۆزی لە لاپەڕەکانی مێژووی بەخوێن نووسراوی گەلی کورد تۆمار کراو، بەردی ناوبراویش هەر بە ئاواتەوەیە، کە تۆی دووبەرەکیو خۆفرۆشیو ناپەسەندی لە ڕەگوڕیشەوە لەنێو کورددا هەڵکەندرێت، هەروەها دەڵێت: هەرگیز متمانە بە بێگانە مەکەن.

# دهـۆك

## دهۆك له مێژوودا:

بێگومانه، كه دهۆك له شاره كۆنهكانی ههرێمی كوردستانی عیراقـه، پرۆفیسـۆر (فـۆر) دهڵێـت: لـه وهختـی ئاشـوورییهكاندا، دهـۆك بـهناو (ئهدیان) ناوبانگی ههبوو، چونكه پایتهختی ههرێمی (دیمـوز)ی ئاشـوری كه نزیكی (بیت داكان) بوو. بێگومان دهۆك شوێنێكی گرنگو بهنرخ بـوو لـهلای ئاشـوورییهكان، چـونكه سـهره رێگـای سـێ دهربهنـدی چـیایی شاخاوی: (دهربهندی دهۆك، دهربهندی قهشـهفرۆ، دهربهنـدی دهر گـهلی شـێخهكان)بـووه. هـهموو هاتوچـۆیهكی ئاشـوورییهكان لهگـهڵ دهوڵـهتی ئورتو و وڵاتی حیسیهكان ههموو لهم سێ دهربهنـدهوه بـووه. كـهوا بـوو دهۆك له شاره كۆنهكانی كوردستانه، بهڵام بهچـی وا دهزانـرێ كـه كۆنـه شاره؟ بهوه، كه پهیكهرو وێنه داتاشراوی ئهشكهوتهكانی دهورهوبـهری، لهگهڵ ئهو گۆڕه كۆنانهدا، كه تا ئێستاش لهم شارهدا ماوهتـهوه. دهـۆك جگه لهوهش ناوچهیهكی گرنگی میرنشینی (داسـنیهكان)ی ژێـری بـووه، ئـهو میرنشـینه لـه پـێش سـاڵی (٩٦١)ز زاییـنیـدا دامـهزراوه، تـا سـاڵی (١٢٣٦)ی زایینی دهسهڵاتدارو فهرمانڕهوا بووه.

میرنشینی داسنیهكان كه بێهێزو ههژار بووه، میرنشینی (شێخان) لـه شـوێنی دامـهزرا، بـهڵام لـه پـاش ماوهیـهكی كـهم بـوو بـه بهشـێك لـه میرنشـینی بههـدینان، كـه تـا سـاڵی (١٨٤٣)ی زایینـی فـهرمانڕهواو دهسـهڵاتداری لـه هـهرێمی بههـدینانا دهكـرد. مێژوونووسـی بـهناوبانگ هارتمان دهڵێت: له كاتی فـهرمانڕهوایی (تاسـیوس بیزاسـیوس)دا دهـۆك

بەناوی (جاهۆك) ناو دەبرا، چونکە تا ئێستاش لە ئەشکەوتی (هەلامەتا) لە چیای (شندوخا) بەرانبەر بە گوندی (گەڤەرکێ) پەیکەرو وێنەی بەردی هەڵکەنراو بەڕووی چیاکەوە ماوەتەوە. وێنەیەك لە وێنە هەڵکەنراوەکانی ئەشکەوتەکە وێنەی پادشای ئاشوری (ئەدرنەرێری)یە. مێژوونووسی کوردی بەناوبانگ (حسین حوزنی موکریانی) دەڵێت: هۆی ناونانی شارەکە بە دهۆك ئەوەیە، کە پادشاهێ یا میرێ لە نیوەی سەدەی چوارەمینی زایینیدا، کە ناوی (ئاخ شندو) بووە، هەر شتێ لە دەغلۆدان، یان بەرهەمی تری کشتوکاڵ، بهاتایە ئەوێ واتە دهۆك، دوو مستی لێیدەستاند بەڵام، هارتمان دەڵێت: "(ئاخشندو) میرنشینێ بووە لە سەدەی دووەمی زایینی لە شندوخا، لەم دواییەدا پاشماوەی گرنگو بە نرخ لە گوندی (ماڵتایێ) کە نزیك شاری دهۆك دۆزراوەتەوە.

شاری دهۆك لە دۆڵێکدا لە بەینی ڕیزە چیای درێژی سپی لە لای باکورەوە، چیای شندوخا لەلای باشورەوەیە. ئەم دۆڵەی کە شاری دهۆکی تیا دروستکراوە، دوو ڕوبار ئاوەدانی دەکەنەوە، یەکەمیان (ڕوباری دهۆك) کە لەسەر ژوورەوە، واتە سەرەوەی شارەوە بەرەو باشووری ڕۆژئاوا تێپەر دەبێت، دووەمیان ڕوباری (هشکەرویە) کە بچوکترە لە یەکەمیانو لە ژێر شارەکەوە بەرەو باشووری ڕۆژئاوا تێپەر دەبێتو دەگاتە ڕوباری دهۆك لە ڕۆژئاوای دۆڵەکە.

دهۆك وەکو نیمچە دورگەیە، کە کەوتۆتە بەینی هەر دوو ڕوبارەکەوە، بە ئاوی هەردوو ڕوبارەکە باغو باغاتو ڕەزی دەوری

شارەکە ئاو دەدرێت، بە مێوەهاتی نایابو ڕەزو باغەکانی بەناوبانگە، ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی گوزەرانی پێدەکەن.

دهۆك لە پاش قیرتاوکردنی ڕێگای بەینی موسڵو ئامێدی، کە لە دهۆکەوە تێدەپەڕێت، کەوتووەتە سەرڕێگاکانی بازرگانی بەینی قەزاکانی کوردی هەرێمی بەهدینانو موسڵو هەولێریش، لەبەر ئەوە بەرەو پێشکەوتنو ئاوەدانبوون دەڕوات، بەتایبەتی لە پاش بایەخ پێدانی هاوینە هەوارەکانی ناوچەی بەهدینان وەکو هاوینە هەواری:( زاویتە، سیارەتویکا، سەرسنگ، سویلاڤ ، ئەرەدناو، بامەڕنێ). لەم ساڵانەی دواییەدا یەکجار گەورە بووە، چەند قەزای کوردی وەکو ئامێدیو زاخۆی پێوە بەستراون، کە لە پێشدا بە موسڵەوە بەسترابوون. دهۆك پاشەڕۆژێکی ڕوناکی هەیە، چونکە دەبێتە ناوچەیەکی بازرگانی، زانستیو پیشەسازی لە بەهدینان.

## ئافرەتی کورد

پایەکی بەرزی کۆمەڵایەتی[1] هەیە لە مێژووی ژیانی کوردەواریدا، بە تایبەتی گەر بێتو سەیری کردەوەی بەهێزو بڵندو پەسندی ئافرەتی کورد بکەین، دەبینین:

دڵی زۆر خۆشە بە مێردو ماڵو منداڵیەوەو بۆیەش هاوبەشی مێردەکەیەتی لە خۆشیو تەنگانەداو، بەمەش بۆمان دەردەکەوێت کە ژنانی کورد تا چ ڕادەیەك دەست ڕەنگینن لە ماڵو منداڵ پەروەردەکردنو یارمەتیدانی دراوسێو چوون بە دەم مێوانەوەو خزمەتکردنی لە کاتێکدا پیاوەکەی لە ماڵەوە نەبێت، زۆری واشیان هەیە بەمەندە ڕازی نابێت، بەڵکو خەریکی قاڵیو بەڕەو خورجو هەگبە، یاخود ماستو پەنیرو ژاژیو دۆو کەرەو فرۆ دروستکردنە، بۆ سودی خێزانو بۆ فرۆشتن لەلایەکی ترەوە، شان بەشانی مێردەکەی لە شاخو کێواندا لە دوای قەزوانو بەڕوو مازووکردنە، یا خەریکی بارکردنو کێشەو شەغرەو بەراو و تووتن چاندنو ڕەزو باخ ئاودان، مەڕو ماڵات بەخێوکردن، دارکردنو کڕینو فرۆشتن لەگەڵ مێردەکەیداو یارمەتیدان لەکارگەو کێڵگەدا.

ئەوەی شایانی باسە لێرەدا، جوانی ئافرەتی کوردە، کە جوانییەکی خوا کردە بەبێ ئارایشو خاڵو نەخشو نیگار ڕشتنە! لە ڕەنگدا سۆرو سپیو گەنم ڕەنگ، لە چاودا ئێسك سوكو شێوە شیرین، لە قژدا ڕەش یا پیرۆزەیی ویا زێرینو بەهۆی پێویستی ژیانەوە سواری وڵاخ دەبن دەگەڕێن لەناو مێرگو چیمەنو دارستاندا بۆیە شۆرشەسوارو تفەنگچینو لە خۆشیدا شایی

---

(١) بۆ ئەم نووسینە سود لە (ئافرەتی کورد)ی مامۆستا (شاکر فەتاح) وەرگیراوە.

ڕەشبەڵەك دەكەنو سەربەخۆیەكی تەواویان هەیە لە هەندێك شوێنا نەبێت لەباری شوكردنداو دڵداری پاك دەزانن بۆ ئەوەی شوی پێبكەن، داوێن پاكنو لەم بارەیەوە یەكێك لە نووسەرە بێگانەكان كە (جانترە) دەڵێت:

داوێن پیسی لەنێوان كۆچەرانی كورددا نییە، بەڵكو بە دەگمەن ئەم ڕەوشتە ڕواڵەتییە دەبینرێت.

هەروەها (میجەرسۆن)و (میستەر ڕیچ) كە هەردووكیان ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیزن لەم بارەیەوە دەڵێن:

(نەتەوەی كورد لە هەموو ڕۆژهەڵاتدا یەكەم نەتەوەیە كە داوێن پاكی ئافرەتی خۆی پاراستووە).

لە زۆر وەختیشا ئافرەتی كورد زیرەكیو چوستو چالاكی نواندوە، فەرمانڕەواییو دەسەڵاتداری داوە بەدەستاو لە خوانەاسو چاكەو نیشتمانپەروەریو زاناییو هونەرمەندیو دڵ تەڕییا لە پیاو كەمتر نەبوو، بەڵكو بۆ نمونە (خاتوو خانزاد– میری سۆران) كە شاژنێكی ئازاو بە جەرگ بوو لە شەڕدا، ژیرو جوامێرو دادپەروەربوو، هەمیشە تێكۆشاوە بۆ ئاوەدانی وڵات، بە كردنەوەی گەلێ قوتابخانەو مزگەوتو نەخۆشخانەو هیچ كاتێك ڕێگەی ژێر دەستیو مل كەچی نەداوە بە دوژمن.

بەڵام (قەدەم خێر)و (قەرە فاتم) دوو نمونەی تێكۆشانی ئافرەتی نەبەزو دلێرو بەناوبانگی كوردستانی ژووروو و كوردستانی ڕۆژهەڵات بوون.

هەروەها (حەپسەخانی نەقیب): سەركردەی ڕاستەقینەی هەموو ئافرەتی سولەیمانی بوو لە رووی كۆمەڵایەتیەوەو لە باشیو كوردپەروەریو مرۆڤایەتیدا، گەلێك لە سەرۆكو پیاوە ناودارەكان ڕاوێژیان پێدەكرد... لە ساڵی (١٩٣٠)ز نامەیەكی دەربارەی مافی نەتەوایەتی كورد نارد بۆ (كۆمەڵی

گەلان)و هەر لەم ساڵەشدا کۆمەڵەیەکی لە سولەیمانی ژنانی دامەزراند، هەموویانی ڕاپێچکرد بۆ خوێندنو تێگەیشتن لە کاروباری کوردایەتیدا. جگە لەوە لە هەموو بارێکا ئافرەتانی سولەیمانی هاندەداو کێشی دەکردن بۆ کردەوەی پەسند، وەك دەستگرتنی داماوانو یارمەتیدانی هەژارانو ڕێزگرتنی زانایان، لە شێوەیەکی ڕێكوپێك، ڕەوشتێکی پاكو بڵندی ئافرەتانی کوردی پێشانی بێگانان دەدا، لەکاتی ڕووکردنیان بۆ شاری سولەیمانی.

دیسان نمونەیەکی تری ئافرەتی ڕەۆشنبیری کورد:

(ڕەوشەن بەدرخان) کە خێزانی (جەلادەت بەدرخان)ە، بۆ پێشکەوتنی وێژەی کوردیو بڵاوکردنەوەی گیانی کوردایەتی تێکۆشاوە.

ئێستاکەش نمونەیەکی جوانی ئافرەتانی زاناو زرنگو سەر بڵندو کردەوە پەسندو نیشتمانپەروەری کوردە لە ناو کوردەکانی ڕۆژئاوادا.

جا ئەمانە کە ڕابەرێکی دڵسۆزی ئافرەتانی کوردستان بوونو هەڵگری مەشخەڵی ڕێگای سەربەستیو ڕزگاری قۆناغی نەتەوایەتی بوون، هەموو هەوڵو کۆششیان بۆ ژنانی ئەمڕۆی کوردستان ئەوەبوو:( کە ئەرکی هەرە گرنگی سەرشانیان، بەوپەڕی ئازایەتیو دڵسۆزیو خۆ بەختکردن، شان بەشانی برا تێکۆشەرە زاناو ڕۆشەنبیرەکان تێبکۆشن بۆ بەدەستهێنانی مافی ڕەوایی کوردو کوردستان. ئەو کاتە دەتوانین بڵێین بەڕاستی ئێوە جێگەی شانازی گەلنو پەروەردەی ئاوی سازگارو بای فێنكو خاکی جوان پڕ پیتی کوردستانن.

## میدیا

میدیای کوردی بە گشتی و تەلەڤزیۆنە ئاسمانییەکان بە تایبەتی کاریگەرییەکی بنەڕەتی لەسەر زمان و ناسنامەی کورد دادەنێن.

کەناڵە تەلەڤیزیۆنە ئاسمانییەکان هەتا (٢٠) ساڵ لەمەوبەر تەنیا لە پاوانی دەوڵەتی نەتەوەییدا بوون و خەونی هیچ لە کوردێکیشدا نەدەهات کورد ببێتە خاوەنی کەناڵی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی خۆی، بەڵام ئەمڕۆ تەلەفزیۆنە کوردییەکان ڕاستینەیەکن لە کوردستان و جیهاندا و هەمان ڕۆڵی تەلەفزیۆنی نەتەوەیی یان دەوڵەتی بۆ کورد دەگێڕن.

سەردەمی ئێستا لە بواری میدیاییدا بۆ کورد دەکرێ وەك سەردەمی گەیشتنی کورد بە ئاسمان لە سەردەمی بەجیهانبوون بناسرێ. یەکێك لە ئاکامەکانی پرۆسیسی میدیا جیهانبوونیش ئەوە بووە، کە بە هۆی تەلەفزیۆنە ئاسمانییەکانەوە، وشیاری نەتەوەیی بەهێزتر بێت و لەو سۆنگەشەوە زمان و ناسنامەی کوردی زیاتر بچەسپێنێت.

یەکەم تەلەڤزیۆنی ئاسمانی، مید تیڤی ڕۆژی ١٥ی مانگی مایسی(١٩٩٥)ز لە لەندەنەوە بۆ یەکەم جار لە مێژووی کورددا، بە شێوەیەکی بەردەوام دەستی بە وەشانکرد و تا ڕۆژی ٢٢ی مانگی مارس ساڵی (١٩٩٩)ز بەردەوام بوو. کوردستان تیڤی لە مانگی (کانونی دووەم) ساڵی( ١٩٩٩) دەستیپێکرد، لە ساڵی (٢٠٠٠)ز بەدواوە کۆمەڵێك تەلەفزیۆنی ئاسمانی کوردی دیکەی، وەك:(ڕۆژ،

زاگرۆس،کوردسات، میزوپۆتا،نەورۆز ،گەلی کوردستان ،کەی ئێن ئێن ،نووچە ،ستێرک...) دەستیان بە وەشاندن کرد.

ئەمڕۆ چەمکی بەجیهانبوون چەمکێکی جێگرتووی ئەکادمییە و لە نێو باسە سیاسییەکان، ئابورییەکان، کۆمەڵایەتییەکان و کولتورییەکاندا وەك تێرمێکی ناسراوی لێهاتووە. بەجیهانبوون لە ئاسمانەوە دانەبەزیوە، لە پاشخانێکی درێژی مۆدێرنەوە سەریهەڵداوە.

لە سنوری بەجیهانبوون تەنها باس لە سنوری خاك و جوگرافی ناکرێ، بەڵکو باسی سنورە کۆمەڵایەتی و کولتوری و ... دەکرێت بەلام تایبەتمەندییەك، کە هەموو جۆری سنورەکانی سەردەمی بەجیهانبوون لەیەکتر نزیك دەکاتەوە، ئەوەیە کە هەموو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤ دەگۆڕدرێن. تێکنۆلۆژی و ئامرازەکانی پێوەندی و ڕاگەیاندن لە سەردەمی بە جیهانیبووندا شوێنەوارێکی زۆر گەورەیان لەسەر لاوازکردن یان بەپێچەوانە پتەوکردنی سنورەکان داناوە، بۆ نمونە بەهێزبوونی هەستی نەتەوەیی لای کوردی بە هۆی دەستڕاگەیشتن بە میدیا و ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بەهێز بووە. ئەگەر تا دوێنێ بۆ نمونە سنور ڕێگری لە چوونی کتێب و بلاوکردنەوەی کوردی لە باشوورەوە بۆ ڕۆژهەلاتی کوردستان دەکرد، ئیمڕۆ هەمان سنور بەهۆی تەلەڤزیۆنی ئاسمانی و ئینتەرنێتەوە سڕاونەتەوەو کامە بەشی کوردستان بێت، جیاوازی ناکات، لە ڕێگەی ئاسمان و ئینتەرنێتەوە لە چالاکییە کولتورییەکانی یەکتری ئاگادارن، ئەوەی کە لە ڕابردوودا وەختێکی چەند ڕۆژەو

تەنانــەت چــەند مانگــەی بــۆ بڵاوبوونــەوەی خەبــەرێك لــە نێــو كــوردان پێویسـت بـوو، ئـەمڕۆ هـەمان هـەواڵ لـە چـركەیەكدا بـە هـەموو شـوێنێكی كوردستان و دەرەوەی كوردستاندا بڵاودەبێتەوە.

تەلــەڤزیۆن وەك یــەكێك لــە كەرەســتەكانی ڕاگەیانــدن، دەتوانێــت كارێــك بكــات، كــە میــدیاكان زۆرتــر و چــڕتر تێكــەڵ بــە ژیــانی كۆمەڵایــەتی مرۆڤــەكان بــبن، دەتــوانرێ بگوترێــت بــە هــۆی میــدیاوە مرۆڤــەكان پێكــەوە پەیوەنــدی دەگــرن، ســەرەرای ئــەوەی لــە شــوێن وكــاتی جیاوازدا دەژین.

تەلــەڤزیۆن دەبێتــە ئاوێنــەی نەتــەوەیی كــە ژن و پیــاو و پــیر و لاو و پێشــكەوتوو دواكــەوتوو خــۆی و ناســنامەی خــۆی تێــدا دەبینێتــەوە، وەك دەگـوترێ زمـان بـەردی بناغـەی ناسـنامە پێكـدەهێنێت، مەبەسـت تــەنها زمــانی نووســین و ئاخــافتن و زاراوەكــانی كــوردی نییــە، بــەڵكو مەبەســت ئــەو زمانــە كــەلتوری یــان چڤاكــــی كولتورییــە كــە بــە هــۆی كاریگەری تەلەفزیۆنە كوردییەكانەوە لای بینەری كورد جێدەگرێت. ١

---

[1] گۆڤاری كۆنفرانسی سالانەی زمانی كوردی، ٢٠١٢، نەتەوەیەك لە ئاسماندا، سیاوەش گۆدەرزی

# ڕاڤەکردنی پەیڤەکان

| پەیڤ | : | واتاکەی |
|---|---|---|
| میدیا | | ڕاگەیاندن |
| سۆنگە | | ڕوانگە، دیدگە |
| وەشانکر | | بڵاوکردنەوە |
| ئەکادیمی | | زانستی |
| تێرم | | زاراوە |
| کەلتوری | | ڕۆشەنبیری |
| جڤاک | | کۆمەڵ |

# پێرست